بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾

---

ناوی کتێب: لێپرسراوێتی بەڕێوەبردن لەئیسلامدا

ناوی نووسەر: حمد حسن رقیط

ناوی وەرگێڕ: محسن سید گولّ فرج

ئۆفسێت: چاپەمەنی سیما

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ١٤٢٦ ك - ٢٠٠٥ز

ژمارەی سپاردن: (٥٩٨) ی ساڵی ٢٠٠٥ وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

وێنەی بەرگ: وێنەی نامەیەکی پێغەمبەرە بۆ مونزیری کوڕی ساوی پاشای بەحرەینی ئەو کاتە کە لە پێستی ئاسک نووسراوەو لە مۆزەخانەدا پارێزراوە.

# پێشکەشە :

-بەنەبەوەکانی ئیسلام ئەوانەی کەبۆ داهاتوویەکی پرشنگدار دەڕواننە بەرنامەی ئیسلام.

-بەکارگەران لەبواری لێپرسراویەتی و بەڕێوەبردن و ئاڕاستەکردن لەپێناو بەختەوەری خەڵکدا.

-وە بە لێکۆڵەرەوەکان کەببێتە نمونەو شێوازی جوان لەچاکی بەڕێوەبردن و ئاڕاستەکردندا.

## پێشەکی وەرگێڕ

(بسم الله الرحمن الرحیم)

الحمدلله الذی خلق فسوی، والذی قدر فهدی وتصلی وتسلم علی رسول الله الذی ارسله الله بالهدی ودین الحق لیظهره علی الدین کله ولـو کـره المشـرکون وعلـی الـه واصحابـه ومـن دعـا بدعوتـه الی یوم الدین وبعد:-

بێگومان ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی ئەمڕۆ کە گەیشتۆتە لوتکە زیـاتر لەئـەنجامی بـەڕێوەبردنو بـەرەو پێشـچوونی ئـەو بوارەیـە لەشـارەزایی و لێهاتوویی و لێزانی و.. هتـد، چونکـە هـەموو کـارێك کـەخوای گـەورە دیـاری کـردووە بـۆ مـرۆڤ یـان رایســپاردووە بەجێبەجێکردنی، بەپێی بەرنامەو دەسـتورێکە، کەئەمـەش واتـای جۆرێك لەرێکخستنو بەشێوەیەکی مەبەستیش واتای (بەڕێوەبردن) دەگەیـەنێ، جگـە لـەوەش هەریـەکێك لەئێمـە هـەر لەهاتنـە دنیـاوەو ژیــانو کاروبــاری رۆژانـــەو پاشــتر (مــردن) وەك باســمــان کـــرد - هـــەمووی بـــەڕێوەبردنی تێدایـــە، کەبەڕێوەبەرەکـــەی خـــوای گەورەیە (جل جلالە)..

دیارە کاتێك دەڵێین بەڕێوەبردنو باسی لێوە دەکەین، دەتوانین بڵێین پێچەوانەی واتای ئەم زاراوەیە (هەرەمەکی)یـە کەبەعـەرەبی پێـی دەڵێـن (فوضـا) کەهـەر لەکۆنـەوەولەهاتنـە دنیـای پێغەمبـەر ئادەمەوە (علیە السلام) ململانێیـەك لـەنێوان ئـەم دوو پرۆسـەیەدا

هەبووە[1] کەتا دواترو ئەمڕۆو داهاتوو بەردەوامە و بەردەوام دەبێت..

ئەم کتێبەی (حمد حسن رقیط)ش کە بەعەرەبی نوسراوەو وەرگێڕدراوەتە، سەر زمانی کوردی، دەرگا والا کردنێکە بۆ تێگەیشتن لەواتای (بەڕێوەبردن) و پێویست بوون بەچونە نێو جیهانێکی فراوانتر لەو بارەیەوە، بەهیواین سودێك بەخوێنەرانی بەڕێز بگەیەنێت و جێی خۆی لەکتێبخانەی کوردیدا بکاتەوە[2]..

سید محسن

٥ شەممە

٢١/١١/٢٠٠٢ - ١٦/رەمەزان/١٤٢٣

---

[1] ئەو فەرمانەی کە خوای گەورە بەپێغەمبەر ئادەمی (علیە السلام) فەرموو لەبەهەشتدا جۆرێك بوو لەبەڕێوەبردن و بەجێنەهێنانی فەرمانەکەش جۆرێك لەبێ بەرنامەیی.

[2] ئەم بابەتە بەچەند مەقالەیەك بەوەرگێڕاوی لەرۆژنامەی (رێگای یەکبون)دا بلاوکراوەتەوە..

پێشەکی:

ئایا لەئیسلامدا زانستی بەڕێوەبردنو پێشەوایەتی هەیە؟

ئایا ئەو زانستییە تەنها زانستێکەو پەیوەندی نییە بەئاینەوەو یان بەشێکە لەئاینو ڕەوشتو پەرستن (عبادەت)؟.

ئایا جێگەو شوێنی بنەما گرنگەکان لەبەڕێوەبردندا کامەیە؟

وەك پابەندبوون بەهێزەوەو ئەمانەت پارێزیو شارەزایی (الخبرە) و سەرپەرشتی لەنزیکەوەو بەتوانایی لەسەر ئاراستەکردنو بەدواچوونەوە (المتابعە) و گرتنەبەری بنەمای ڕاوێژکردنو پلانو نەخشە دانان لەهزری ئیسلامەوە؟

ئایا نەبونییەکانی بەڕێوەبردن وای کردووە کە بەڕێوەبردنی هاوچەرخ (تازە) دروست ببێت؟

ئایا توانای بەرنامەی ئیسلام چەندە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی بەڕێوەبدرنی هاوچەرخو دروست کردنی پێشەوایەتیەکی سەرکەوتوو؟ ئەوا لەم پەرتوکەدا وا وەڵامیان دەدرێتەوە بەکورتیو پوختیو بەپشت بەستن بەبەڵگەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانو فەرموودەو سوونەتەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئاراستەو هەڵسوکەوتی زاناکانو ئەندێشمەندەکان.

داواکارین لەخوای گەورە ئەم هەوڵە بکاتە دەست مایەیەکی ئاسان بۆ بانگ خوازانو پەروەردەکەرانو قوتابیانی زانستو گشت خوێنەران..

بێگومان خوای بالا دەست چاکترین ڕێنمونی خوازە بۆ شارێگەی سەرفرازی.

والسلام عليكم

حمد حسن رقيط

# کەسایەتییەکی کامڵی ئیسلامی:

بەڕێوەبردن لەئیسلامدا بەشێکە لەکەسایەتی مسوڵمان، کەسایەتی موسڵمانیش کەسایەتییەکی کامڵو تەواوە، کۆدەبێـەوە لەنێوان ئاینو ماددەو روحداو، هەموو جوڵەیەك کەدەجوڵێتەوە لەم ژیانەدا پێویستە مل کەچ بێت بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی. بەکارکردن بەفەرمانەکانی خوای گەورە کەدەفەرموێت:

(قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) (الانعام:١٦٢-١٦٣).

واتە: (بڵێ بێگومان نوێژەکەمو بەندایەتیو خواپەرستیمو قوربانیو سەربڕینمو ژیانو مردنیشم بۆ ئەو خوایەیە کەپەروەردگاری هەموو جیهانیانە. هیچ جۆرە هاوبەشێك نییە بۆ ئەو خوایە. وە هەر بەوشێوەیەو بەو جۆرە فەرمانم پێ دراوە، وە من یەکەم سەردەستەی هەموو ئەوانەم کەگوێ رایەڵو ملکەچن بۆ خواو بۆ فەرمانەکانی خوا).

لەئیسلامدا پەیوەندی مرۆڤ بەپەروەردگارییەوە پەیوەندییەکی سنوردار نییە لەعیبادەتێکی دیاری کراوداو لەچەند کاتێکی دیاریکراودا، واز لەهەڵسوکەوتی بهێنرێت لەژیانیدا بێتو بچێت بەبێ یاساو رەوشتو دین هەروەك چۆن زانراوە لەپابەندبوانی دینەکانو نەتەوەکانی تر. نەخێر بەڵکو واتای ئیسلام لەلای موسڵمان یاسایەکی هەمەلایەنەیە، گشت بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە لەدەوڵەتو نیشتمان وەیان حکومەتو نەتەوەو بەهەمان شێوە رەوشتو هێزیشە یان بەزەییو دادپەروەرییەو رۆشنبیرییەو یاسایە وە زانستو ماددە و بەروبومەو

دەست کەوتو دەوڵەمەندی‌یەو تێکۆشانو بانگەوازە هەروەها سوپاو هزری‌یە هەروەك چۆن بیروباوەڕێکی راست گۆیەو پەرستنێکی راستیشە.

وە زانایانی ئیسلام پێناسەی پەرستنیان کردووە بەوەی کەناوێکی کۆیە لەهەموو ئەو شتانەی کەخوا خۆشی دەوێنو لێیان رازییە، لەوتەو کردەوە دەرەکیو ناوەکییەکان، وەك نوێژو زەکاتو رۆژو حەجو راستگۆیی لەکردارو گوفتاردا وەجێبەجێ کردنی ئەمانەتو چاکەکردن لەگەڵ دایکو باوکدا و سەردانی خزمو کەسو دەرنەچوونە لەپەیمانەکان، واتە فەرمان کردن بەچاکەو رێگەگرتن لەخراپەو تێکۆشان دژی کافرانو منافیقەکان.

چاکە کردن لەگەڵ دراوسێو هەتیوو هەژارانو گشت نەوەکانی ئادەمیو گیانلەبەران، وەنزاکردنو یادی خوا کردن وەخوێندنی قورئانو تێگەیشتن لەواتاو مەبەستەکان وە چەندین نمونەی تر لەم شێوانە کەبریتین لەپەرستن وە هەروەها خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی وەترسان لەخوای گەورەو دڵسۆزی بۆ ئاینەکەی تەنها لەبەر خاتری خوا.

هەروەها ئارامگرتنو دانایی (حیکمەت)وسوپاسگوزاری نیعمەتەکانی، وە رازی بوون بەویستی خواوە پشتیوان بەستن بەخواو داواکردنی بەخشندەیی و،وەترسان لەسزای خوای گەورە وە نمونەی تریش لەم شێوانە بریتین لەپەرستن.

ئا بەم شێوەیە دەبینین ئیسلام کە خوای گەورە کردوویەتیە دەستور بۆ ژیانی ئادەمیزادو لایەنێکی ژیانی بەجێ نەهێشتووە بەبێ لایەنێکی تر تاکو درێژترین ئایەت کەدابەزیوە لەپەرتوکەکەی خوای گەورەدا لەسەر بوارێك لەبوارەکانی دنیایە ئەوەش بریتیە لەپەرتوکی قەرزەکان (دیون) لەئایەتی قەرز لەسورەتی بەقەرەدا. هەروەك چۆن ئاشکرا بوو

کەپێغەمبەر ﷺ هیچ فەرمانێکی بەجێ نەهێشتووە کەنزیکمان بکاتەوە لەخوای گەورە بێگومان فەرمانی پێداوین‌و ئاگاداری کردوینەوە لەسەری وە هیچ فەرمانێکی بەجێ نەهێشتووە کەخراپ بێت‌و ئاگاداری نەکردبینەوە لەسەری. تاکو دورە پەرێز بین لێی، وە بەشێوەیەکی وا روونی کردۆتەوە شەوی وەك رۆژ ەمەگەر کەسێك خۆی لێ گێل بکات‌و خۆشی توشی تاوان‌و گومڕایی بکات.

ئا بەم جۆرە تێگەیشتنە کەدروست بووە کەسایەتی موسڵمانی کامڵ‌و لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی بەرێوەبردن لەکەسایەتی موسڵماندا یەکێکە لەو بوارانەی کەپشت گوێ خراوە‌و مافی خۆی پێنەدراوە لەبڵاوکراوەو نوسراوەکاندا،بۆیە بەپێویستیەکی سەرشانم زانی کەچەند پەیقێکی لەسەر هەڵدەمەوە تاوەکو ببێتە یاد خەرەوەیەك بۆ خاوەن ژیرەکان پاشان زیندوکردنەوەی نوسینەکانی زانایانی خاوەن رێز لەنمونەی زانا دڵسۆزەکان وەك (ابن تيمية) لەپەرتوکی (السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية) و (ماوردي) لە (الاحكام السلطانية) و (الكفاءة الادارية في السياسة الشرعية) نوسینی د. عبدالله بن احمد قادري.

## یەکەم

## "سیفەتەکانی بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو"

### ١-بەڕێوەبردن و بنەمای ئەمانەت:-

بەڕێوەبردن بریتییە لەو چالاکییە ئاڕاستەکراوەی، کە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت بەرەو ڕووی کۆمەڵ لەشێوەی هەڵسوکەوتێکی کردەیی‌دا کە کار لەخەڵکانی تر دەکات، وە هەڵدەستێت بەئاڕاستەکردنیان. وەکار لێکردنیان بەوشێوەیەی کەدەیەوێت.

بەڕێوەبردن لەئیسلامدا ئەمانەت و بەرپرسیاریەتیەکە هەڵێنجراوە لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ .

(كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته)[٢].

واتە: (هەمووتان شوانن و وە هەمووتان بەرپرسیارن لەسەرئەوەی لەژێر دەستاندایە)، بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، وە بەرپرسیاری لێهاتوو گرنگیەکی گەورەیان هەیە لەسەر کاری بەڕێوەبردن لەفەرمانە پێویست و هەنووکەییەکانی ژیانی مرۆڤایەتییە.

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کاتێك لێپرسراوی لێهاتوویی لەدەست دا، ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە دەبێتە کۆمەڵگەیەکی لەیەك هەڵوەشاوەن بوو لەناوچوو. بیردۆزەی ئیسلام لێرەوە دەڕوانێتە کاری بەڕێوەبردن و پێشەوایەتی، کەپێش گشت بیردۆزەو بیرۆکەکانی تر کەوتووە، بەڵگەشمان ئەوەیە ئەگەر تەنها تەماشای ئاگادارییەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەین گرنگی‌یەکی

---

(٢) ئەم فەرموودەیە بەتەواوی لەصحیحی جامدا بەژمارە (٤٥٦٩) و ئیمام احمد و ئەبو داودو ترمذی ریوایەتیان کردووە فەرموودەیەکی (متفق عليه).

زۆرمان لەم روەوە بۆ دەردەكەوێت بۆ نمونە كاتێك سێ كەس دەردەچن بۆ سەفەرێكی كورت دەبێت یەكێكیان بكەنە (ئەمیر) یان (بەرپرس) بەسەر ئەوانی ترەوە.

كە دەفەرموێت: (اذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدكم)[٤].

واتە: (كاتێك سێ كەس دەرچون بۆ سەفەرێك با یەكێكیان بكەنە ئەمیر)..

وە بەڕێوەبەری سەركەوتوو، لەگۆشەنیگای ئیسلامەوە خاوەنی كۆمەڵێك بنەماو بنچینەی سەرەكییەو یەكێك لەو بنەمایانە بریتیە لەئەمانەت پاراستنی ئەوەی كە لەژێر دەستیدایەو بریتییە لەجێبەجێكردن و دابینكردنی مافەكان بۆ خاوەنەكانیان (أداء الحقوق) و سیفەتێكی پێویست و گرنگە، وە یەكێكە لەبنەما سەرەكیەكانی بەڕێوبەری سەركەوتوو كە بەهۆیەوە، دەتوانێت خەڵكی بەختەوەر بكات، وە بە لەدەست دانی ئەمانەت خەڵكی تووشی ئازارو نەشكەنجە دەبێت. بەهۆی گرنگی ئەمانەتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت:

(إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ)(النساء: من الآية٥٨).

واتە: (خودا فەرمانتان پێدەكات بەدانەوەی سپاردەكان بۆ خاوەنەكانیان، وە كاتێك كە فەرمانڕەوایی دەكەن لەنێوان خەڵكیدا دادپەروەر بن).

---

[٤] ئەم فەرموودەیە لەصیح و جامعی ئەلبانیدا بەژمارە (٥٠٠) وە لەسننی ئەبوداود ئاماژەی پێكراوە.

خوای گەورە سیفەتی ئەمانەتی کردووە بەسیفەتی بەندە چاکەکانی (عباد الصالحین).

(وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ) (المؤمنون:٨).

واتە: (بەندە چاکەکان ئەوانەی کە چاودێری ئەمانەتو پەیمانەکانیان دەکەنو خیانەتو فێڵ ناکەن). وە ئیسلام بەتوندی ئاگاداری کردوینەتەوە، لەسەر پاراستنو فەوتانی ئەمانەتو دورکەوتنەوەو بەرگریکردن لەناپاکی (خیانەت)، چونکە ناپاکی (خیانەت) پێچەوانەی ئەمانەتە، خوای گەورە دەفەرموێت:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) (الأنفال:٢٧)، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ناپاکی مەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی(ناپاکی مەکەن لەسپاردەکانی ناو خۆتان، لەکاتێکدا کەئێوە دەزانن ناپاکی یە)، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إذا وسد الامر الى غير أهله فانتظر الساعة)[٥].

واتە: هەرکاتێك فەرمانبەری کارێك درایە کەسێك کەشیاوی ئەو کارە نەبێت، ئەوا چاوەڕێی قیامەت بن.

وە ئەو کەسەی پارێزگاری ئەمانەت ناکات بەپێچەوانەکەی دەناسرێت کەبریتییە لە ناپاکی (خیانەت)، ناپاکیش نیشانەیەکە لەنیشانەکانی دووڕووی (نفاق)، ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر کۆمەڵێك لەلێپرسراوەکان لەبەڕێوەبەرییەکانیاندا ئەوەیە، کەسیفەتی ئەمانەتیان لەدەست داوە توشی هەڵەی گەورە بوون، بۆیە بەهۆی ئەمەوە زیان

---

[٥] ئەم فەرمودەیە لەصحیحو جامعی ئەلبانیدا بەژمارە (٨٣٦) و ئیمام بوخاری هێناویەتی لەئەبوهریرەوە.

لەبەرژەوەندی گشتی کەوتوە، ئەو فەرمانبەری کەسیفەتی ئەمانەتی نییە زۆر بەئاسانی فرو فێڵ لەخەڵکی دەکاتو بەجۆرەها ئامراز کارەکانیان دوا دەخاتو پەیمانەکانی جێبەجێ ناکات،وە زۆر جار خراپەو سزا بەکار دەهێنێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەن، ئەو کەسەی ئەمانەت ناپارێزێت چاودێری پەیمانەکانی ناکات، کەداویەتی بەخەڵكو لەکاتی کارکردندا ئەوەی لەئەستۆیدایە جێبەجێی ناکاتو پێشێلی دەکاتو بەهەدەری دەبات، وەك چۆن ئەمانەتەکانی تری خەڵکی بەهەدەرو فەوتان بردووە.

خیانەتکاری ئەمانەت وا گومان دەبات، لەکارەکەدیا دەسکەوتو قازانجێکی بەدەست هێنا بێت، بەلاَم تەنها خەسارەتمەندی دنیاو قیامەت دەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ)(يونس: من الآية٨١).

واتە: بێگومان خوای گەورە کاری خراپەکاران چاك ناکات.

لە (حذیفەی کوڕی یەمانەوە گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەخەڵکی نەجرانی راگەیاند کەئەمینێکتان (امیر) بۆ رەوانە دەکەم بەڕاستی ئەمیندار بێت (فەرمانڕەوا / لێپرسراو) پێغەمبەر ﷺ بەناو هەموو هاوەڵەکاندا گەڕاو (اباعبیدە)ی بۆ ناردن.

پاشان فەرمووی: (إن لکل أمة امین وإن امین هذه الأمة أبوعبیدة بن الجراح)[٦].

---

[٦] بوخاری ریوایەتی کردووە لەئەنەسەوە وە لەصحیح جامعی ئەلبانیدا ئاماژەی پێکراوە بەژمارە ٢١٤٧.

واتـه: (بێگومـان هـەموو گـەلێك ئـەمینداریێکی هەیـە وە بێگومـان ئەمینداری ئەم گەلە ئەبا عوبەیدەی جەراحە).

هـەروەها لەفەرمودەیـەکی تریـدا دەفـەرموێت: (الخـازن المسـلم الامـين الذي يعطى ماأمر به كاملا موفرا طيبة به نفسه فيدفعه الى الذي أمر له به أحدا المتصدقين)[٧].

واتـه: (گەنجینـەوانی ئـەمینداری موسـڵمان ئـەوەی کـەخوا فـەرمانی پێکردوە جێبەجێی دەکات وەك خۆی وە بەم کارە دڵ و دەروونـی خـۆی ئاسوودە دەکات، بـەهۆی ئەمـەوە دەبێتـە یـەکێك لەڕاسـتگۆیان کـەخوا لەقورئاندا ئاماژەیان پێدەکات.




[٧] ئیمانی ئەحمەد ریوایـەتی کردووە لەسەنەدەکەیداو ئـەبو داود نسـائی و (متفـق عليه) ەو لەصیح جامعی ئەلبانیدا ئاماژەی پێکراوە. بەژمارە (٢٣٣٦).

## ٢-بەڕێوەبردن و بنەمای زانستی و شارەزایی (الخبرة):

بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو ئەوەیە کەبەڕێوەبەری بەتواناو خاوەن رادەیەکی زۆر لەلێهاتووەو شارەزاییەکی تەواوی زانستی لەبوارەکەی خۆیدا هەبێت و، بەزانست و شارەزایی لێپرسراو دەتوانێت بینەر بێت بەسەر کارەکاندا وە چاك و خراپ لەیەکتر جیا بکاتەوە، بەتوانا بێت بەسەر فەرمانەکانیدا، ئەگەر ئەم سیفەتەی لەکارەکاندا نەبو توشی تێکچوون و روخانێکی گەورە دەبێت، هەروەك چۆن ئیسلام مەرجێکی سەرەکی لەزانست و شارەزایی داناوە بۆ هەر کەسێك، کەدەبێت بەلێپرسراوی کارێك یان چەند کەسێك جا ئەو کارە بچوك بێت یان گەورە خوای گەروە لەسەر زمانی یوسفەوە دەفەرموێت: (قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِـنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ) (یوسف:٥٥).

واتە: یوسف و وتی (حەز دەکەم) بمکەیت بەلێپرسراوی گەنجینەکانی سەر زەوی (ئەم وڵاتە) لەبەرئەوەی من پارێزگاری و زانستم لایە، هەروەها خوای گەورە باسی تالوت دەکات کەهەڵبژارد بەمەلیکی بەنی ئیسرائیل بەوەی کەخاوەنی زانست و خاوەنی هێز بووە.

(قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ )(البقرة: من الآية٢٤٧).

واتە: وتی: خودا لەنێو ئێوە هەڵیبژاردووە، چونکە شارەزاییەکی باشی لەزانست هەیە، واتە زانایە، هەروەها خاوەن هێزێکی باشە. لەبەرئەوەی ئەو کەسەی خاوەنی زانستە جێگەی متمانەی خەڵکی یەو خۆشیان دەوێت بەچاوی رێزەوە تەماشای دەکەن دەیکەنە جێگەی متمانەی خۆیان و ماڵ و منداڵیان.

ئەگەر تەماشا بکەین و وردبینەوە خوای گەورە گیاندارانیشی بەپێی توانای زانستیان لێکی جیاکردونەتەوە وەکو خوای گەورە حەرامی کردووە کەبەسەگی فێرنەکراو راوبکرێت، هەروەها گیاندارانی تریش بەوشێوەیەو پێویستی لێپرسراو بەزانستی دوو فەرمانی بۆ داین کردووە:-

١-ئاگاداربوون لەحوکمەکانی حلال و حرام، وە راوەستان لەسەر ئەو شتانەی کەسنورەکانیان دیاریکراوە بۆئەوەی سنوریان نەبەزێنێ.

٢-رازاندنەوەی لێپرسراو بەزانست، گەورەترین کارە کە خەڵکی بەهۆیەوە خۆشیان بوێت و دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی رابکێشێت، بەبێ زانست خەڵکی لێی دوردەکەونەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لێپرسراوی نەزان (جاهل) ناچار بێت کۆمەڵێك یارمەتی دەر (معاون) دابنێت لەم کاتەشدا بەسێ حاڵەتدا دەڕوات:-

أ-کارەکان بۆ یارمەتی دەرەکان بەجێ بهێڵێت ئەوانیش دەست بەسەر گشت کارەکاندا بگرن و خۆشی لەسەرەوە بمێنێتەوە، بۆئەوەی پارێزگاری لەپلەکەی خۆی بکات.

ب-خۆی بەتەنها فەرمان بەسەر خاوەن زانست و شارەزایاندا بکات و بەئارەزووی خۆی بەشێوەیەکی چەوت و نەزانی کارەکان جێبەجێ بکات ئەم حاڵەتە زۆر خراپترە لەوی تر.

ج-نەفامەکان لەخۆی نزیك بکاتەوەو شارەزاکان بگرێ و ئازاریان بدات، لەترسی رەخنەگرتن، لەهەڵسوکەوتی و کردەوەکانی ئەم حاڵەتەش بریتییە لەئاشوب و تێکچون، بێگومان ئەم حاڵەتە لەدوو حاڵەتەکەی تر خراپترە.

کاری مرۆڤی لێپرسراو رێك و پێك و چاك نابێت و بەردەوام نابێت، بەزانست و شارەزایی نەبێت (العلم والخبرة) هەروەها بەراوێژکردن لەگەڵ

خاوەن تجربەو شارەزاكاندا وە ریزگرتن لەو كەسانەی كەپسپۆڕن، وە دانانی كەسی شیاو لەجێگەی شیاوداو لەئاراستەكردنەكانی ئیسلامدا هاتووە كەبریتی‌یە لەداكۆكی لەسەر گرنگی پسپۆڕی‌و زانست بۆ كەسێك دەبێتە لێپرسراوی كارێك، یان چەند كەسانێك خـوای گـەورە لەباسـی داودو سـلێماندا (علیـهما السـلام) دەفـەرموێ: (وَكُلّـاً آتَيْنَـا حُكْمـاً وَعِلْماً)(الانبياء: من الآية٧٩).

واتە: (لەلایەن خۆمانەوە، دانایی‌و زانستمان پێبەخشیوون).

*   *   *



## ٣-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو سیفەتی خۆ بەکەم زانین -خاکەڕایی (صفة التواضع):-

زۆر کەس پێی وایە کەلێپرسراویەتی‌یەکی دەست کەوت لەوێوە دەست بکات بەزوڵم‌و زۆرو زەوت کردنی مافەکانیان وەلوت بەرز بکات‌و گوێ نەدات بەداواکانیان حکمەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا، پێویستی بە بەشێکی زۆری رەوشتە جوانەکان هەیە، هەرکەسێك خاوەنی ئەم رەوشتانە بێت، خاوەنی دڵی خەڵکی دەبێت‌و متمانەشی پێدەکەن، خوای گەورە باسی سیفاتی باوەڕداران دەکات‌و دەفەرموێت: (أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ )(المائدة: من الآية٥٤).

واتە: ملکەچ‌و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ ئیمانداران، وە سەر بڵندو دەرون بەرزن بەسەر کافران دا لەپێناوی خوادا.

وە سیفەتی خۆ بەکەم زانینی -خاکەڕایی- کردووە بەسیفەتێکی سەرەتایی بۆ بەندە باوەڕدارەکانی (وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً) (الفرقان:٦٣).

بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کەزۆر بەسەلاریی بەسەر زەویدا دەڕۆن، وە کاتێکیش کەنەفامان (بەقسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن) دەڵێن: سڵاو (خۆیان لەشەڕیان دەپارێزن).

هەروەها لەئاراستەکانی تری پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (وما تواضع أحد لله إلا رفعه). واتە: هیچ کەسێك نییە کە لەبەر خوا خۆی بەکەم زانیبێت‌و خوا پلەو پایەی بەرز نەکردبێتەوە، ئیسلام سیفەتی خۆ بەکەم زانینی داناوە بۆ گشت کەسێك کە لێپرسراویەتیەکی هەبێت. وەك خوای گەورە بانگ لەپێغەمبەرەکەی دەکات‌و دەفەرموێت: (وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) (الشعراء:٢١٥).

واتە: باڵی (بەزەیی و میهرەبانی) خۆتیان پێبەخشە بەو خاوە باوەڕانەی شوێنت کەوتوون: ئەو کەسەی خۆی بەگەورە بزانێت (متکبر) لەکات و شوێنی لێپرسراویەکەیدا ئەوا دەبێتە مایەی رق و کینەی خەڵك وە خەڵکی لێی دور دەکەونەوەو فەرمانەکانی جێبەجێ ناکەن بەزۆر نەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی و دوبەرەکایەتی و جێگیرنەبوونی هێمنی و ئاسایش و دڵنیایی لەنێوان لێپرسراوو ئەو کەسانەی کە کاریان لەگەڵدا دەکات.

ئەوخۆ بەکەم زانینەی کەئیسلام مەبەستیەتی و داوا لەگشت موسڵمانان بەتایبەت لەلێپرسراوان دەکات بریتیە لەو خۆ بەکەم زانییە کەهەڵێنجراوی دڵسۆزی خوای گەورەو نەرمو نیان و بەسۆز لەگەڵ خەڵکدا وە جێبەجێکردنی داواکاریەیکانی خەڵك بێت، وە خۆ بەکەم زانینی درۆ بریتییە: لەوخۆ بەکەم زانینەی کەکەسێك بەقسە دەیڵێت و بانگەشەی بۆ دەکات، بەڵام بەکردەوە نایسەلمێنێت وە یان خۆ بەکەم زانینێك بەمەبەستی بەدەستهێنانی سوودمەندییەکی باش بۆ خۆی و وە خەڵکی بەچاکە باسی بکەن.

خۆ بەکەم زانینی راستگۆ بەڵگەیە لەسەر بەهێزی خاوەنەکەی، هەروەك چۆن خۆ بەگەورە زانین (التکبر) بەڵگەیە بۆ بێ هێزی خاوەنەکەی نمونەی راستیش بۆ ئەمە بریتیە لەژیانی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی راشدین[8]، پێغەمبەر ﷺ پێشەوای بڕواداران خۆی سەردانی نەخۆشەکانی دەکردو دڵنەوایی دەکردن و ئامادەی جەنازەیان دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا تێکەڵی چەوساوەو بێ نەواکانیان دەبوو هەروەها خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب لەکاتی فەرمان رەواییەکەیدا پەیمان دەدات بەپیرێژنێکی کوێر لەنزیك مەدینە کەمافی بۆ دابین بکات و دادپەروەر بێت. بەڕاستی ئەو کەسەی خۆی بەگەورە نازانێت ئەوا هەستی کردووە بەلێپرسراویەتیەکەی لەبەر رەزامەندی خوای گەورە.

---

[8] وەك چۆن خوای گەورە فەرمانی پێکردووین کەمەلسوکەوت و کردەوەکانیان بکەینە سەر مەشقی ژیانماندا کەدەفەرموێت: (أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ)(الأنعام: من الآية ٩٠).

### ٤-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو سنگ فراوانی:-

باوەڕداری لێپرسراو دەبێت لەگەڵ ژێر دەستەکانیدا سنگ فراوان بێت، دوور بێت لەرق و کینەو تۆڵەسەندنەوە، گوێ نەگرێت بۆ غەیبەت و بوختان، ئەم سیفەتانە دەسەلاتی لێپرسراو کەم دەکەنەوەو کارەکانی خراپ دەکەن وە دەبێتە هۆی لەدەست دانی متمانەی لێپرسراو لای ژێر دەستەکانی و توشی حاڵەتێکی گومان و دڵەڕاوکێ دەبێت وە لەکۆتاییدا لای دەبەن و لێپرسراوێکی تر جێگەی دەگرێتەوە، خوای گەورە باسی ابراهیم دەکات علیه السلام بەوەی کەنامەی خوای گەورەی بەسنگ فراوانی وەرگرتووە (سلامه الصدر) دەفەرموێت: (وَإِنَّ مِنْ شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ، إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ) (الصافات:٨٣-٨٤).

واتە: بێگومان لەشوێنکەوتەو پەیڕەوانی (نوح)، (ئیبراهیم)ە (سەلامی خوایان لێبێت). رووی کردە پەروەردگاری، یەکتاناسین، بەپیر بانگەوازییەوە چوو، بەدڵێکی پڕ لەئیمان و خواناسی،

خوای گەورەش فەرمانی کردووە بە بڕواداران هەڵگری ئەم سیفەتە بن کە دەفەرموێت: (وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ)(الحشر: من الآية ١٠).

واتە: وە هیچ کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە بەرانبەر بڕواداران ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەر تۆی بەخشندەی میهرەبان.

پێشەوای بڕواداران محەمەد ﷺ یەکێك لەسیفەتەکانی ئەوە بوو بەردەوام حەزی دەکرد سەردانی هاوەڵانی بکات، بەدڵفراوانییەوە (سلامه الصدر) قەت حەزی نەدەکرد شتێك لەدڵیدا بهێڵێتەوەو بیخواتەوە بەڵکو زۆر بەدڵفراوانییەوە سەردانی دەکردن و لێی دەپرسینەوە.

گێردڕاوەتەوە لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعود کەپێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد لەکاتی پەیمانی حونێن داو لەوکاتەدا پیاوێکی ئەنصاری هاتوو وتی: مەبەستی ڕووی خوا نییەو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان پێم ڕاگەیاند پێغەمبەر ﷺ ڕووی گۆڕاو پاشان فەرمووی (ڕەحمەتی خوا لەسەر موسا بێت زۆر لەوە زیاتر ئازار دراو ئارامی گرت).

لەباسێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ تورە بوە لەو هەواڵەو دەم و چاوی سور هەڵگەڕا، پاشان ئەنصاریەکە وتی: زۆر خۆزگەم دەخواست هەواڵەکەم پێنەگەیاندایە.

هەروەها لەباسێکی تردا هاتووە کەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا يبلغني أحد عن أصحابي شيئا فاني أحب أن أخرج عليهم وأنا سليم الصدر) واتە: کەس هیچم پێ نەگەیەنێت لەسەر هاوەکاڵەکانم من حەز دەکەم بەدڵێکی بێگەردەوە بچمە لایان،واتە هیچ شتێك لەدڵما نەبێت بەرامبەریان.

بۆیە زانایان حوکمێکی گرنگ دەخەنەڕوو، ئەویش ئەوەیە نابێت شت بگەیەنرێتە لێپرسراوی موسڵمانان تەنها ئەوە نەبێت کەتایبەتە بەکەسایەتی خۆیەوە بەمەرجێك ئەو قسەیە مەترسیەکی نەبێت بۆ سەر کۆمەڵگەکەی.

بەڵام ئەو فەرمانەی کەپەیوەندی هەبێت بە بەرژەوەندییە گرنگەکانەوە، پێویستە ئەو فەرمانە بگەیەنرێتە لێپرسراو.

هەروەك چۆن بۆمان ڕوون دەبێتەوە لەچیرۆکی (زیدی کوڕی ئەرقەم) کاتێك نوسراوێکی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەرز کردەوە لەسەر (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) سەرۆکی دوو ڕووەکان ئەوەش بریتی بوو لەوتەی (لا تنفقوا على من عند رسول الله حتى ينفضوا من حوله) واتە: دوو ڕووی

بەسەر ئەو کەسانەوە مەکەن کە لەخزمەتی پێغەمبەران تاکو لێی نەتەکنەوە. پێغەمبەر ﷺ لای خۆی دیاری کرد، پاشان خوای گەورە سورەتی (منافقون)ی نارده خوارەوە لەسەر راستگۆیی، زیدو ناشیرین کردنی دوو رووەکان. تاکو سیفەتی بێگەردی دڵفراوانی (السلامه الصدر) لەلایەن لێپرسراوەوە جێگیر بێت پێویستە ئاگاداری سێ فەرمان بێت:-

١-پێویستە رێگە بەخەڵکی بدات کە بێنە لای و روو بەڕوو راستی یەکان ببینێت، تاکو خەڵکی گومانی خراپی پێ نەبەن و غەیبەتی خراپی نەکەن خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ) (الحجرات:٦).

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێك هەواڵێکی بۆ هێنان (خێرا بڕوای پێ مەکەن)، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە (تا بۆتان روون دەبێتەوە)، نەوەکو بەنەزانی ئازارو ئەشکەنجەو گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکن، دوایی پەشیمان ببنەوە لەوکارەی کەپێی هەستاون).

٢-رێگە نەدان بەقسە هێنەرو بوختنان چییەکان تاکو و غەیبەتی خەڵکانی تر بکەن لەمەجلیسەکەیدا بەشێوەیەك پڕ بێت لەغەیبەت چی و ئاشوب گێڕو پیلان چییەکان بەئارەزووی خۆیان درێژە بەقسەی خۆیان بدەن. ئەمە زیان دەدات لەدڵ فراوانییەکەی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلا تَجَسَّسُوا وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ) (الحجرات:١٢).

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لەگومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن (بۆیە پێویستە لەهەموو گومانێك خۆبپارێزن)، وە بەشوێن کەموکوڕیی و عەیب و عاری یەکتریدا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن، وە لەپاشملە باسی یەکتری مەکەن، و ناوی یەکتری بەخراپ مەبەن، ئایا کەستان پێیخۆشە گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟!

دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتە لەخوا بترسن و پارێزگاربن بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کەدەستبەرداری گوناه دەبن و لێی پەشیمانن، خوداش میهرەبانی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێت.

٣-لێپرسراو دەبێت چاکە کاران و لەخواترسان بکاتە پشتیوانی خۆی و راوێژیان پێ بکات، چونکە رێ نمونی دەکەن لەسەر خێر وە باسی خەڵکی ناکەن بەخراپەو تەنها بۆ بەرژەوەندی کار نەبێت.

* * *

خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت:

(رەحمەتی خوا لەو کەسەی عەیبەکانی خۆم بە دیاری بۆ دەنێرێت)..

## ٥-بەڕێوەبردن و بنەمای پابەندبوون بەهێزەوە (القوة):-

یەکێك لەبنەما سەرەکی و پێویستەکانی لێپرسراوی بەڕێوەبردن بریتییە لەبەهێزی و بەتوانایی لەجێبەجێکردنی بڕیارو فەرمانەکاندا و نابێت لاوازو دوو دڵ بێت چونکە بەلاوازی و دوودڵی لەدەستی دەدات زۆر لەبەرژەوەندییەکانی خەڵکی و، بەهێزو سوربون لەسەر بڕیارەکانی دەتوانێت گشت ئەو گرێ و لەمپەرانە رامالێت کەدێتە رێگای وە تێبکۆشێت بۆ گەیشتن بەمەبەستەکان و جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکان، ئیسلام زۆر داکۆکی کردۆتەوە لەسەر گرنگی پابەندبوونی لێپرسراو بەهێزەوە، چونکە هێز فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ جێبەجێکردنی بڕیارو فەرمانەکانی و خوای گەورە بانگی نەوەی ئیسرائیل دەکات و دەفەرموێت:-

(خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)(البقرة: من الآية٦٣).

واتە: ئەوەی پێمان داون باش کاری پێبکەن وە بیربکەنەوە لەوانەی کە تیایەتی، بەڵکو پارێزگاری بکەن لەخۆتان لەنافەرمانی خوا. هەروەها خوای گەورە لەباسی دێوەکانی سولەیماندا لەسەر بەتوانایی و لێهاتوییاندا، بەسەر ئەو کارەی کەپێیان دەسپێردرێت دەفەرموێت: (قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ) (النمل:٣٩) واتە: یەکێك لە دێوەکان (جنی) ووتی بە سولەیمان کۆشکی بەلقیساتان بۆ دەهێنم پێش ئەوەی لە جێگەو مەقامەکەت هەڵبستیت، وە من بەهێزم لە هەڵگرتن و هێنانیدا، وە ئەمیندارم لە سەر ئەو زێڕو زیوەی لە سەریەتی، وە لە باسی کچی پێغەمبەر (شوعەیب)دا هاتووە کە بە باوکی دەفەرموێت (يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ)(القصص: من الآية٢٦). واتە: باوکە بەکرێی بگرە (موسى) سودبەخشترین و بەهێزترین و نیازپاکترین کەست بەکرێ گرتوە.

وە پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت: (المؤمن القوی خیر واحب الی الله من المؤمن الضعیف)[٩].

واتە:- باوەڕداری بەهێز چاکترەوە خۆشەویسترە لەلای خوای گەورە لەباوەڕداری لاواز. بەهۆی پلەو پایەی بەهێزیەوە باوەڕداری بەهێز خۆشەویسترە چونکە بەهۆی ئەو هێزەوە دەتوانێت فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکات. وە ئەو کەسانەی کەزیاتر پێویستیان بەهێزە، لێپرسراو و ئەمیرەکانن و یان هەرکەسێکی تر کە دەبێتە بەرپرس لەکارێك یان فەرمانێك و یان بەرپەرسی کۆمەڵە خەڵکێك.

پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردوینەتەوە لەدانانی کەسانی لاواز لەسەر کارو فەرمانەکانی موسڵمانان، چونکە بەهۆی ئەو لاوازو کەمتەرخەمییەوە لەلێپرسراوێتیەکەیدا ناتوانێت ئەرکەکانی جێبەجێ بکات.

لەئەبو زەرەوە گێڕدراوەتوە، کە دەفەرموێت بەپێغەمبەری ﷺ خوام فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لێپرسراویەتیەکم نادەیتێ (واتە ببێتە والی یان لێپرسراوێتی لەجێگەیەکدا)پێغەمبەر ﷺ بەسەرشانی کێشام و فەرموی: (یا اباذر إنك ضعیف وانها امانة وانها یوم القیامة خزی وندامة إلا من أخذها بحقها وادی الذي علیه فیها)[١٠].

---

[٩] بوخاری ریوایەتی کردوە لەئەنەسەوە وە لەصیح جامعی ئەلبانیدا ئاماژەی پێکراوە بەژمارە (٢١٤٧).

[١٠] ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لەسەنەدەکەیداو ئەبو داود نسائی و (متفق علیه)ەو لەصیح جامعی ئەلبانیدا ئاماژەی پێکراوە بەژمارە (٣٣٣٦).

واته: ئەی ئەبازەر تۆ لاوازیت، و لێپرسراویەتی ئەمانەتەوە لەرۆژی دواییدا سەرشۆڕیو پەشمیانیە، تەنها ئەگەر کەسێك حەقی خۆی بداتێو وەك خۆی جێبەجێ بکات. وە یەکێك لەهەڵوێستە روونەکانی پێغەمبەر ﷺ سووربونو داکۆکی کردن بوو لەجێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە لەسەر بڕیاری سنوری دزی کردن بەبێ خوێندنەوەی سۆزو بەزەیی بۆ کەسوکارو نزیکەکانی خۆی تاکو رۆژێك بە(ئوسامە)ی فەرموو، کەخزمو خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بوو.

(أتشفع في حد من حدود الله؟ وأيم والله لوان فاطمة بنت محمد سرقت تقطع محمد يدها)[11].

واتە: ئایا داوای لێبوردن دەکەی لەبڕیارێك کەسنوری خوای گەورەیە؟ سوێند بێت بەخوای گەورە ئەگەر (فاتمە)ی کچی (محەمەد) دزی بکات ئەوا (محمد) دەستی دەبڕێت.

خەلیفەکانی راشدیش لەسەر رێگاو رێبازی پێغەمبەر ﷺ رۆیشتونو بەردەوام بون لەسەر ئەو شێوازە، بەتایبەتی بەهێزو سووربون لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکاندا، ئەوە خەلیفە ئەبو بەکری صدیقە، ئەوەستێت بەرەو رووی ئەوانەی پەشیمان بونەوە لەئیسلام (مرتد) بەهەڵوێستێکی ئازایانەوە دەڵێت: (والله لأقتلن من فرق بين الصلاة والزكاة

---

[11] متفق علیە ابوداود، ریوایەتی کردووە، لەعائیشەوە لەصیحی جامعدا ژمارە ٧٨١٤.

فان الزكاة حق المال والله لو منعوني عقالا كـانوا يؤدونـه الى رسـول الله ﷺ لقاتلتهم على منعه)[١٢]

واتـه: سـوێند بـەخوا شـەڕیان لەگـەڵ دەکـەم، هەرکەسـێ جیـاوازی لەنێوان نوێژو زەکاتدا بکات بێگومان زەکات حەقی ماڵەو سوێند بێت بەخوا ئەگەر پەتە گوریسێکیان هێناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئێستا نەیدەن شەڕیان لەگەڵ دکەم، لێیان دکوژم تـاکو لێیـان دەسـتێنم. وە عومـەری کوڕی خەتابیش لەسـەر ئەو شێوازو ڕێبازە بەردەوام بوو، و بێجگە لـە بەهێزەکان هیچ کەسێکی دانەئەنا بەلێپرسراو (ئەمیر).

وە شرحبیل کوڕی حەسەنی لادا لەسەر ولایەتی شام پاشان وتاری بۆ خەڵکەکە خوێندەوە وتی: (أيها النـاس أنـي والله مـاعزلت شـرحبيل عـن سخطه وكان اردت أقوى من شرحبيل).

واتـە: ئەی خەڵکینـە سوێند بێت بەخوا مـن شـرحبیلم لانەدا بەهۆی خراپی‌یەوە، بەڵکو دەمـەوێت پیـاوێکی بـەهێزتر لـەو دا بنێم بەڕاسـتی خەلیفـە عومـەر بـەهێز بـوو لەوتـەو بۆچوونـدا. ئـا بـەم شـێوەیە هـێز سیفەتێکی پێویستە بۆ لێپرسراوی بەڕێوەبردن، تاکو بتوانێت بەهۆیەوە هـەق بچەسپێنێت وە دوریخاتـەوە لەخراپـەو ئاشـوب بـەبێ دڵـەڕاوکێ و لاوازی بڕیاری گونجاو جێبەجێ بکات.

---

[١٢] ئەم فەرموودیە لەصیح الجامعدا هەیە بەژمارە ٧٨٤٥ وە بەم شێوەیەی‌تر هاتووە (یا أسامە اتشفع في حد من حدود الله) ئەم فەرموودەیە متفق علیە لەئەبوداودەوە، روایەت کراوە، ئەویش لەعائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە.

## ٦-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو و سیفەتی پشوودرێژی و لەسەرخۆیی (الحلم):-

زۆر لەبەڕێوەبەرەکان و لێپرسراوانی ئەم سەردەمە ئەم ڕێتێکیان تیا بەدی دەکرێت، ئەوەش بریتیە لەوەی کەسینە تەسکن و زوو توڕە دەبن داواکاریەکانی خەڵکی جێبەجێ ناکەن و ڕێگە بەخەڵکان نادەن سەردانیان بکات.

هەروەها بێ حەوصەڵەن لەکاتێ کە خەڵکی دێنە لایان بۆ جێبەجێکردنی داواکاریەکانیان، و هەڵدەچن و توڕە دەبن بەڕویاندا، ئەمەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی متمانەو ناشرین بوونیان لەبەرچاوی خەڵکی.

لەڕاستیدا ئەگەر لێپرسراو هەڵسا بەکارێك گەورە بێت یا بچووك، ناتوانێت جێبەجێی بکات ئەگەر پشوو درێژو سنگ فراوان نەبێت،چونکە زۆربەی کارەکان بەپشوو و درێژی و ئارام گرتن دەگاتە ئەنجام.

خوای گەورە پێغەمبەرەکەمانی هەڵبژارد ﷺ بەم سیفەتە، بۆیە دادەنرێت بەپێوستیە گەورەکانی لێپرسراو، چونکە ڕێنمونی کەرو پێشەوای خەڵکە بۆ چاکە. خوای گەورە دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) دەفەرموێت: (إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ)(التوبة: من الآية١١٤).

واتە: کاتێك ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت، داوای لەپەروەردگاری کرد کەمناڵێکی باشی پێببەخشێت، و خوای گەورەش مژدەی دا بەگیرابوونی داواکەی ڕۆژی دا بەکوڕێك وەسفی دەکات بەحلیم کەئیسمایلەو یەکێکە لەوانەی کەهەڵگری نامەی پەروەردگارە واتە پێغەمبەری خوایە. خوای گەورە دەفەرموێت: (رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ، فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلامٍ حَلِيمٍ، فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي

اذبحك فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ) (الصافات:١٠٠-١٠٢).

واتە: نەتەوەکەی بەجێهێشت و کۆچی کرد، داوای لەخودای کردو وتی: پەروەردگار نەوەیەکی چاك و پاکم پێببەخشیت، ئێمەش مژدەی کوڕێکی بەئارام و خۆگرو ژیرمان پێ بەخشی کە (ئیسماعیل)ە، کاتێك کە ئەو منالە کەوتە دەرو ماڵ لەگەڵیا (بەیانیەك پێ وت) کوڕی شیرینم بێگومان من دەمبینی لەخەودا کەتۆ سەر دەبڕم،
تۆ دەڵێی چی؟ رات چۆنە؟! کوڕی چاك و خواناس و خۆگر بەزمانی شیرین وتی: بابەگیان هەر فەرمانێکت پێ دراوە جێبەجێی بکە. ئەگەر خوا حەز بکات لەئارامگران دەبم. پێغەمبەر ﷺ بەشێوەیەکی باش باسی ئەو کەسانەی کردووە کە خاوەنی حیلمن واتە: پشوو درێژن. وەك چۆن (ئیبن عباس) و (ئەبو سعیدی خدری) گێڕاویانەتەوە. (رەزای خوایان لێ بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی بەئشجع عبدالقیس: (إن فيك خصلتين يحبها الله ورسوله الحلم والاناة)[١٣].

واتە: تۆ دوو لایەنت تێدایە، کەخواو پێغەمبەری خوا خۆشی دەوێن ئەو دوانەش پشوو درێژی و نەرم و نیانیە.

ئەگەر سیفەتی پشوو درێژی داوا کرا بێت لەگشت موسڵمانان ئەوا بۆ موسڵمانی لێپرسراو زۆر پێویستە ئەمەش لەبەر ئەم هۆیانە:-

هۆی یەکەم: خەڵك لەڕەوشت و هەڵسوکوت و گوێڕایەڵیدا چوونیەك نین، هەندێکیان هەڵەیان لێ ڕوودەدات ئەمەش دەبێتە هۆی مانگرتن و کارنەکردن و سوربون لەسەر داواکاریەکانیان و دەنگ بەرزکردنەوەیان بەسەر لێپرسراوەکانیاندا، لەم کاتەدا ئەگەر لێپرسراو بەتوڕەیی و قسەی ناخۆش و بەزۆر بیان گێڕێتەوە سەر ڕاستی و چاکە لێی دەردەچن و

---

[١٣] رواه مسلم والترمذي.

پشتی تێدەکەن و ئەگەڕێن بۆ دەرفەتێك کە لەدەستی رزگار بن ئا لێرەدا پشوو درێژی (الحلم) داوا کراوە بۆ چارەسەرکردنی هەندێك لەکێشەکان.

هەروەك چۆن توندوتیژیش کات و جێگەی خۆی هەیە هەر سیفەتەو لەکات و جێگەی گونجاوی خۆیدا دەبێت، ئەگەر هاتوو لێپرسراو لەزۆربەی کاتەکاندا، پشوو درێژ نەبوو ئەوا خەڵکی تووشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبن.

هۆی دووەم: ئارام و پشوو درێژی لێپرسراو، لەگەڵ کارگوزارەکانیدا هۆکارێکە بۆ راکێشانی دڵیان بەلای خۆیدا، ئەمەش رێبازێکی دانایی _ حکیمانەیە _ بۆ نەهێشتنی هەڵەکانیان، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێك بەرق و تورە بونەوە سەردانی لێپرسراو بکات، لێپرسراویش بەخۆشەویستی و پشوو درێژیەوە لەگەڵیدا بدوێت نەك بەتوندوتیژی و سزادان وەلامی بداتەوە، بەهۆی ئەو دەسەلاتەی کە هەیەتی و کاتێك بینی لێپرسراویش بەرویەکی خۆشەوە لەگەڵیدا دەدوێت ئەوەش دەبێتە هۆی تەریق بوونەوەو گەڕانەوە بۆ سەر خودی خۆی ئەمە دەبێتە لابردنی خراپە لەدڵیدا.

هۆی سێیەم: بەپشوو درێژی و ئارامگرتن، لێپرسراو لەسەر کارەکەی، دەمێنێتەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی راکێشانی دڵی خەڵکی بەلای خۆیدا وە جێگەی خۆی لەناو دڵ و دەرونیاندا دەکاتەوەو خۆشیان دەوێت.

نمونەش بۆ ئەمە پشوو درێژی پێغەمبەرە ﷺ کە پێشەوای باوەڕداران و نمونەی پێشەوایەکی چاك بووە، زۆر لە عەرەبە دەشتەکی یەکان دەهاتنە لای و بەجۆرەها جلوبەرگ و بۆنی ناخۆش دەستیان لەجل و بەرگ و عەباکەی دەداو زۆرجار عەباکەیان لەسەرشانی دەخستە خوارو، یان زۆرجار عەباکەیان لێدەستاند، پێغەمبەریش ﷺ

بەزەردەخەنەوە تەماشای دەکردن و بەخشندە بوو لەگەڵیان داو بە بەردەوامی لەلایان دەمایەوە، تاکو ڕۆژێك ئافرەتێکی جولەکە ژەهری بۆ دەخاتە خواردنەکەوە کاتێك پێیان زانی هاوەڵانی داوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد کەبیکوژێت بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێنەدان. ئا بەم شێوەیەش خەلیفەکانی پاش خۆی لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئەو بەردەوام بوون، بەڕاستی ژیرو پشوو درێژ بوون. وەك زاناکان دەڵێن بەئارامگرتن و دڵنیاییەوە پێشەوایەتی دێتە دی.

* * *

ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێت)دەفەرموێت،

بە منالّی بێ هەستی

بە گەنجی مەستی

بە پیری سستی

ئەی کەی خوا پەرستی

## ٧-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو سیفەتی نەرمو نیانی (اللين):-

نەرمو نیانی لەکاردا بریتی نیە لەوە تۆ پشتی لێ بکەیتەوەو کارەکات بدەیت بەسەر چەند کەسێکداو خۆت بەهیچ شێوەیەك لێی نەپرسیتەوەو بەدواچوونەوە نەکەیت، تاکو کەسایەتیەکەت لەناو بچێت.

ئەمە بریتی نیە لەنەرمو نیانی بەڵکو نەرمو نیانی دژی توندوتیژیو تورەییە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: (فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ )(آل عمران: من الآية١٥٩).

واتە: ئەی محەمەد بەهۆی بەزەیی (رحم)ی خوارەیە تۆ نەرمو هێمنی لەگەڵ ئەوانەدا، خۆ ئەگەر تورەو دڵرەق بویتایە، هەموو لەدەورت دوور دەکەوتنەوە.

بەم ئایەتە بۆمان دەردەکەوێت کەسیفەتی نەرمو نیانی لای لێپرسراو زۆر گرنگەو لەپلەو پایەی بەرز دەبێتەوە، خەڵکی خۆشیان دەوێت، گوێڕایەڵی دەکەن، وە بەپێچەوانەوە ئەگەر توندوتیژیو لێدانی بەکارهێنا، ئەوا لێی دووردەکەونەوەو گلەییو گازەندەی لێ دەکەن.

سیفەتی نەرمو نیانی لەکاری بەرێوەبردندا (ئیداریدا) بەمانای هاوڕێیەتی (الرفق) لەگەڵ خەڵکداو بەبەزەییو سۆز لەهەڵسوکەوتداو، کێشەکانیان بۆ سوك بکاتو روخۆشو لێو بەخەندە بێت لەگەڵ خەڵکیو ژێردەستەکانیدا وە داواکارییەکانیان قبوڵ بکات وە کار بکات بۆ جێبەجێکردنیان لەکاتێکی دیاری کراودا ئەگەر نەیتوانی جێبەجێیان بکات با بەقسەیەکی جوان وەڵامیان بداتەوە.

خوای گەورە ئامۆژگاری موساو هارون دەکات کەدەفەرموێت:- (اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى) (طه:٢٤)، (فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً )(طه: من الآية٤٤).

واتە: ئەی موسا بڕۆن بۆ لای فیرعەون چونکە لەفەرمانی خوا لای داوە، بەلام بەشێوەیەکی نەرم لەگەڵیا بدوێن، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أثقل شيء في الميزان المؤمن خلق حسن إن الله يبغض الفاحش المتفحش البذيء)[١٤].

واتە: گران ترین شت لەتەرازووی ئیمانداردا لەڕۆژی قیامەتدا رەوشتی جوانە خوای گەورە تورە دەبێ لەو کەسەی کە کردەوەی ناشیرینەو گوفتاری ناشرینەو جنێو دەرە) وە دەفەرموێ: (أتق الله حيثما كنت واتبع السيئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلق حسن)[١٥].

واتە: لەخوای گەورە بترسە لەهەر شوێنێك بویت و لەدوای تاوانێك یان خراپەیەك یەکسەر چاکەیەك بکە تاوانەکەت دەسڕێتەوە وە لەگەڵ خەڵکیدا رەوشت بەرز بە .ولەفەرمودیەکی صحیح دا کە عائیشە گێراویەتی یەوە هاتووە.

کەرۆژێکیان پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر پێش ئەوەی کەبێتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (بئس أخو العشيرة وبئس ابن العشيرة).

واتە: خراپترین برای هۆزەکەیەو خراپترین کوڕی هۆزەکەیە، بەلام کاتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر بەڕویەکی خۆش پێشوازی لێکردو بەڕویەکی خۆش بەڕێی کرد، بەلام کاتێك رۆیی (عائشە) پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا فەرموت ئەم کابرایە ئاواو ئاوایە، کەچی هاتە لات بەو شێوە چاکە پێشوازیت کردو بەڕێت کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ان شر الناس منزلة يوم القيامة من تركه الناس اتقاء شره)[١٦].

---

[١٤] البیهقی ریوایەتی کردوە، و لەصحیح جامعدا هاتووە بەژمارە (١٣٥).

[١٥] ترمذي ریوایەتی کردووە، وە ئیمامی ئەحمەد ئەبوداودو حاکمو بیهقی لە (شعب الایمان) داو لەصحیح جامعدا هاتووە بەژمارە (٩٧).

[١٦] متفق علیه وصحیح جامعی ئەلبانیدا هاتووە بەژمارە ٧٩٣١.

فەرموی خراپترین کەس لەڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە خەڵکی لەشەڕ یان خۆیان دەپارێزن.

وە دەفەرموێ: (أن الله رفق يحب الرفق ويعطي على الرفق مالا يعطي على العنف وما لايعطي على سواه)[17].

خوای گەورە نەرمو نیانەو کەسی نەرمو نیانی خۆش دەوێت، وە ئەو پاداشتەی خوای گەورە لەنەرمو نیانیدا دەیبەخشێت لەتوندوتیژیدا نای بەخشێتو لەغەیری ئەمەش نایبەخشێت.

*　　*　　*

## ٨-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو سیفەتی لێبوردن (العفو):

هەڵەی خەڵکی زۆرن بەڵام دوو جۆرن، جۆری یەکەم: لەکەسانێکدا روودەدات، کە سورن لەسەر هەڵەکانیان بۆ ئەوەی گوێ بدەن بە بەرژەوەندی خەڵکیو گەورەی دەکەن‌و، ئەم کۆمەڵە چاك نابن تەنها بەسزادان‌و سەرزەنشت کردن نەبێت، جۆری دووەم: هەڵەی رەمەکی‌یە کە لەکەسانی بێ ئاگا ڕودەدات، ئەم جۆرە داندەنێن بەهەڵەکانیاندا، وە داوای لێ خۆش بون دەکەن ئەم کۆمەڵە لێخۆشبوونیان باشترین رێگەیەو مافی خۆیانە عەفو بکرێن.. لێخۆشبوون لەهەڵەو هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی تر لەسەریان ئەمەش بریتییە لەو رەوشتە جوانەی کەقورئانی لەسەر دابەزیوەو وەسونەتەکانیش بێگومان جەختی لێوەدەکەن لەقورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بانگ لەپێغەمبەر ﷺ دەکات دەفەرموێت: (وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ )(آل عمران: من الآية١٥٩).

---

[17] مسلم ریوایەتی کردووە لەعائشەوەو لەصحیح جامعدا بەژمارە (٤٠٤١).

واتە: ئەی محەمەد ﷺ گەر بهاتایە دڵ ڕەق و ڕووگرژ بویتایە، کەست لەدەور نەدەما بۆیە لێیان ببوورەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەو، لەفەرماندا ڕاوێژیان پێ بکەو دەفەرموێت: (فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)(المائدة: من الآية١٣).

واتە: ئەی محەمەد لێیان خۆشبەو لاپەڕەیەکی تازە هەڵبدەوە لەگەڵیان دا و بێگومان خوداش، چاکەکارانی خۆش دەوێت. وە دەفەرموێت: (خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ) (الأعراف:١٩٩).

واتە: لێبوردن بەکاربهێنەو فەرمان بەچاکە بکەو خۆت لەنەفامەکان لادە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مازاد الله عبدا الا عزا)[١٨]

واتە: خوای گەورە لەهەر کەسێك خۆشبوو بێت سەربەرزی پێ بەخشیوە، نەرم و نیانی و لێبوردن زۆربەی ژیانی پێغەمبەری ﷺ داگیر کردبوو.

هەروەك عائشە دەفەرموێ: (والله ما انتقم لنفس في شيء يؤتى اليه حتى تنتهك حرمات الله فينتقم الله).

واتە: سوێند بەخوا لەهیچ شتێك تۆڵەم نەسەندووە، جگە لەوەی کەسنورەکانی خودای نەبەزاندبێت هەروەها لێپرسراوی ئیداری زۆرجار ناخۆشی و خراپەی لەگەڵ دەکرێت بەڵام ئەو دەبێت لێبوردەبێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى )(البقرة: من الآية٢٣٧)، واتە لێخۆشبونت لەچاکەکاران نزیکت دەخاتەوە لەخوا، بەڵام تۆڵەسەندنەوەو دانانی سزا (عقوبە) بۆ کەسێك کەشایەنی عقوبە بێت، ونقر

[١٨] مسلم ریوایەتی کردووەو ئەحمەدو ترمذی لەئەبی هریرە وەو لەصیح جامعدا بەژمارە (٥٨٠٩).

تاوانبار بێت لەو کاتەدا عقوبە بۆ سەرزەنشت وە تەمێ کردنی چاکترین ڕێگەیە، وە بۆ پاراستنی یاساو بڵاونەبوونەوەی ئاشوب (وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ) (الشورى:٤٣).

واتە: لەڕاستیدا ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێتو چاوپۆشی بکاتو لێخۆ شبووبێت (لەکاتێکدا کەدەتوانێت تۆڵە بسێنێت) ئەوە نیشانەی توندوتۆڵییە لەکارەکانیدا.

*   *   *

## ٩-بەڕێوەبردنی سەرکەوتو سەرپەرشتی لەنزیکەوە:-

سەرپەرشتی نزیك بریتی نییە لەوەی کەلێپرسراو ئاگاداری شتی گەورەو بچوك بێت، یان جاسوس دابنێت بەسەر ژێر دەستەکانیەوەو بێزاریان بکات هەر کەسێك ئەمە بکات متمانەی خۆی لەدەست دەدات لەنێوان ژێردەستەکانیدا، مەبەست لەسەرپەرشتی ئەوەیە کە لێپرسراو لەنزیکەوە سەرپەرشتی بکات، وە بەدواداچوونەوە لەکاری جێگرەکان بکات وە چاودێری چالاکی فەرمانبەرەکانو کرێکارەکانی بکات، چاودێرییەك بەمەبەستی دڵنیایی بێت لەسەر کارەکانیان، وە لێپرسینەوەی ئەوانە بکات کە کەم تەرخەمی دەنوێنن لەکارەکانیان وە ئەگەر پێویستی کرد سزایان بدات بۆئەوەی کۆتایی بەو دواکەوتنەو کەمتەرخەمیە بهێنێت، وەتاکو ئاگادارییەك بێت بۆ گشت کرێکارەکانی تر. لەئیسلامدا سەرپەرشتیاری ڕووبەڕوو، گرنگی زۆری پێدراوە، بۆ زانینی کێ شایەنی پاداشتەو کێ کەمتەرخەمە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی لەنزیکەوە سەرپەرشتیاریان کردوە، نەوەك سەرپەرشتیاری بکاتە مەرکەزیەتێکی تەواو (مطلق) وا بکات وزەی

کارمەندەکان لەکاربخات، پاشان وازیان لێ بێنێ و بەدواچوونەوە نەکات، ئەرك و فەرمانەکانی ئیسلام لەوزەی مرۆڤ دایە، چونکە وزەی مرۆڤ دیاری کراوەو، لەوە زیاتر بەدەر نییە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا)(البقرة: من الآية٢٨٦).

واتە: هەرکەس بەگوێرەی توانای خۆی خوای گەورە فەرمان لەسەری ئەرك دەکات، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أكلفوا من العمل ماتطيقون فان الله لايمل حتى تملوا وان احب العمل الى الله تعالى أدومه وان قل)[٢٠].

واتە: ئەو کارانەی دەیکەن با لەتوانای خۆتانا بێت وە خوای گەورە لاتان نادات تا خۆتان لانەدەن وە خۆشەویسترین کار لای خوای گەورە کاری بەردەوامە ئەگەر کەمیش بێت وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:-

(يا أيها الناس عليكم من الاعمال ما تطيقون فان الله لايمل حتى تملوا وان احب الاعمال الى الله مادووم عليه وان قل)[٢١]. هەمان واتای فەرمودەی پێشوو، وە دەفەرموێت: (اعلموا فكل ميسر لما خلق له)[٢٢].

واتە: کار بکەن و هەموو کارێکی ئاسان کەسێکی بۆ دانراوە کەبیکات. بەهۆی سەرپەرشتی نەکردنی لێپرسراو بەسەر کارەکەیەوە کۆمەڵێك خەوش و کەم وکوڕی لێدەکەوێتەوە کەبریتین لەمانە:-

١-بێ ئاگایی لەو شتانەی کەڕوودەدات لەجێگەی کارەکەیدا ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی تێکهەڵپڕژاندن و کەمتەرخەمی و ستەم کردن.

---

[٢٠] فەرموودەیەکی صحیحە ئەبوداود و والخسائر لەعائشەوە گێڕاویانەتەوە.

[٢١] متفق علیە وە لەعائیشە وەرگێڕدراوەتەوە لە (صحیح جامع) دا ژمارەی ٧٨٨٧.

[٢٢] صحیحەوە طبرانی لەئبن عباس و عمرانی کوڕی حنصە وە گێڕدرایەتەوەو لە (صحیح الجامع) دا ژمارەکەی ١٠٧٤.

٢-بوار دەرەخسێ بۆ دەرون نەخۆشەکانو تەماعکاران بۆ دەست گرتن بەسەر پلەو پایەکاندا کەدڵنیان لێپرسراوەکەیان سەرپەرشتی و متابەعەیان ناکات.

٣-تانەو تەشەرە لێدانی خەڵك لە لێپرسراو بەهۆی کەمتەرخەمی و سەرپەرشتی نەکردنەوە ئەمەش دەبێتە هۆی لەدەست دانی متمانەو گیانی هاوکاری لەنێوان خۆیوفەرمانبەرو کرێکارەکاندا.

لەو نمونانەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی بەجێهێشتوین لەسەر سەرپەرشتیاری راستەوخۆ (مباشر) ئەمانەن:-

ا-ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ خۆی لەنزیکەوە سەرپەرشتی گۆڕەپانی جیهادی دەکردووە. خۆشی لەگەڵیاندا دە جەنگا کە لە (١٩) جەنگا ئامادە بووەو لە (٨) جەنگدا خۆی جەنگاوە.

ب-بەشداری کردن لەگەڵ سەربازەکانیدا لەهەڵکەندنی چاڵی خەندەق.

جـ-بەشداری کردنی سەربازەکانی لەدورستکردنی مزگەوتدا. وە ئەو کارانەی کە بۆ خۆی لەنزیکەوە سەرپەرشتی نەکردووە. پلانی بۆ داناوەو هاوەڵێکی شارەزای بۆ داناوە، تاکو جێبەجێی بکات لەپاش تەواوبوونی کارەکە خۆی بەدواچوونەوەی ئەنجامداوە.

## ١٠-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو - بەتوانا لەئاراستەکردندا

لەهەڵــە ئاشــکراکانی بــەڕێوەبردنی هاوچــەرخدا بــێ توانـــایی بەڕێوەبەرەکانــە لەئاراســتەو فــێرکردن‌و راهێنــانی ژێــر دەســتەکانیاندا، ئەمەش دەبێتە هۆی نەگونـجان‌و لەیەك نەگەیشتن وەیان لەدەستدانی متمانە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان‌و داواکاریەکانی سەرەوە.

بێگومــان ئیســلام چارەســەری ئــەم کێشــەی بــەڕێوەبردنی کــردوە بەچارەسـەرێکی ســەرکەوتوانە وە بەیــەکێك لەسیفەتەکانی بەڕێوەبـەری سەرکەوتووی داناوە، ئەمەش بریتیە لەبەتوانایی لەسەر ئاراستەکردن‌و فێرکردن‌و گواستنەوەی ڕاوبچۆنەکان بۆ خەڵکانی تر ئەمەش هۆیەکە بۆ سەرکەوتنی لێپرسراو لەکارەکەیدا.

وە پێغەمبــەری ئــازیز خــۆی لێپرســراوی یەکــەمی موســڵمانان بــوو، خــوای گــەورە لەلێپرســراویەتی بانگــە وەزەکــەیدا کــاری فــێرکردن‌و پەروەردە کردن‌و ئاراستەکردنی پێ سپاردبوو کەپێی دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِــهِ وَيُزَكِّـيهِمْ وَيُعَلِّمُـهُمُ الْكِتَـابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ) (الجمعة:٢).

واتــە: هــەر ئــەو زاتــە (خــوای بــاڵا دەســت) لــەناو خــەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لەخۆیان رەوانەکرد، ئایەتــەکانی قورئانــە کەی ئەوزیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، وە دڵ‌و دەرن‌و رواڵەت‌و ئاشــکراو نادیاریان پوخت دەکات، فێری قورئان‌و دانایی‌و شەریعەتیان دەکات، هەرچەندە ئەوانــە پێشــتر لــەگومڕایی و ســەر لێشــێواویەیکی ئاشــکرادا گیریان خواردبوو.

وە لەئاراستەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ فەرمانڕەواکان (ولاة) لە (ئەبوبوردە) وە (خوا لێی رازی بێت) گێڕدراوەتەوە کە دەڵێت پێغەمبەر ﷺباوکم کە (ئەبو موسای ئەشعەری) بوو لەگەڵ (معاذی کوڕی جەبەل)ی نارد بۆ یەمەن پێیانی فەرموو: (یسروا ولاتسعرا وبشرا ولاتنفرا وتطاوعا)[٢٣].

واتە: ئاسانکار بن لەنێوان خەڵکیدا وەبەهیچ شێوەیەك قورس کارمەبن، موژدە دەربن وە خەڵکی مەترسێنن تاکو دوورە پەرێز بن، وە یارمەتی دەری خەڵك بن لەئیشوکارەکانیاندا.

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (بشرا ویسرا وعلما ولاتنفرا)، واتە: موژدە دەرو ئاسانکار بن وە خەڵکی فێر بکەن و مەیان ترسێننو دوریان مەخەنەوە لەخۆتان.

لەم ئاراستەی پێغەمبەردا ﷺ دوو راستی گرنگمان بۆ روون دەبێتەوە؛-

یەکەمیان: نەرمو نیانیو ئاسانکاری لەگەڵ کەسانی خوار خۆت ئەمەش دەبێتە هۆی بەدرەوام بوونی خۆشەویستیان بۆت وە کوژاندنەوەی ئاگری بەرهەڵستکاریان.

دووەمیان: بێگومان سەرکەوتنی لێپرسراو و بەڕێوەبەرەکان بەوە دەبێت کەیەکگرتوو یەك هەڵوێست بن وە تاڕادەیەکی گەورە تێگەیشتنیان هەبێت لەنێوان یەکتردا، وە ئەگەر جیاوازو ناکۆك بن لەگەڵ یەکتریدا ئەوا رەنگ دانەوەیەکی خراپی دەبێت بۆ کەسانی خوار خۆیان وە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی چەند کۆمەڵو رێکخراوێکی جیاخوازو خراپ دوور لەیەك، بەمەش یەکگرتوویی یەکریزیان نامێنێت.

---

[٢٣] ئیمام ئەحمەد و بوخاری ریوایەتیان کردووە، لەئەدەب المفرددا وە ئەلبانی دەری هێناوە لەصحیح الجامع دا بەژمارەی ٤٠٢٧.

وە لەم ئاشوبو روخانەدا کەبەلای مرۆڤی ژیرەوە کەم نیە، زانای گەورە (حافظ) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: لەفەرمودەی فەرمانکردن بەئاسانکاری لەگشت فەرمانەکان وە نەرمو نیانی لەگەڵ هەڵکیدا وەخۆشەویستکردنی باوەڕ لەلایان، وە دورکەوتنەوە لەتوندوتیژی نەوەك دڵی خەڵکیت لێبڕەنجێت، بەتایبەت ئەوانەی لەسەرەتای وەرگرتنی ئیسلامەتیدان وەیان تەمەنیان نزیك بۆتەوە لەجێبەجێکردنی ئەرکەکان لەمناڵاندا تاوەکو باوەڕ لەدڵو دەرونیاندا بچەسپێ و خۆیان ڕابهێنن لەسەر باوەڕەکەیان.

وە لەئاڕاستەکانی ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لەسەر بێت) جێنشینی (خلیفە) یەکەمی پێغەمبەر ﷺ کاتێك هەڵیان بژارد بۆ کاری جێنشینی (خلیفە) ئەم ئاراستە جوانەی کردن، (أيها الناس قد وليت عليكم ولست بخيركم فان أحسنت فاعينوني وإن أساة فقوموني الصدق أمانة والكذب خيانة والضعيف فيكم قوي عندي حتى آخذ له الحق والقوي فيكم ضعيف عندي حتى أخذ منه الحق إن شاء الله تعالى لايدع احد منكم الجهاد فانه لايدعه قوم الا ضربهم الله بالذل أطيعوني ماأطعت الله ورسوله فاذا عصيت الله ورسوله فلا طاعة لي عليكم وقوموا الى صلاتكم يرحكم الله).

واتە: ئەی خەڵکینە بوومە فەرمانڕەواتان کە لەئێوە باشتر نیم، ئەگەر چاکم کرد یارمەتیم بدەن ئەگەر خراپم کرد راستم بکەنەوە، راستگۆیی ئەستۆپاکی‌یە (ئەمانەتە) و درۆکردن ناپاکیە (خیانەتە)، بێ هێزتان لای من بەهێزە تاکو مافەکەی بۆ دەگێڕمەوە، وە بەهێزی ئێوە لاوازە لای من تاکو مافەکەی بۆ دەگێڕمەوە بەپشتیوانی خوای گەورە، هیچ کەسێکتان دوورمەکەونەوە لەتێکۆشان لەرێی خوادا (جهاد) هەر هۆزێك دورکەوێتەوە لەتێکۆشان (جهاد) ئەوا خوای گەورە زەلیلو سەرشۆڕی دەکات، گوێڕایەڵیم بکەن بەگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەگەر

سەرپێچی خواو پێغەمبەرم کرد ئەوا گوێڕایەڵیم مەکەن،هەڵسن نوێژەکانتان جێبەجێ کەن بەڵکو خوا لێتان رازی بێت.

لەم وشانەی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق دا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەشێوازی سیاسەتی کاری فەرمانڕەوایی یەکەی لەبازنەی ئەم خاڵانەی خوارەوەدا دەخولێتەوە:-

یەکەم: خەلیفە خۆی بەیەکێك لەوات دەزانێت هەرچەندە کاری فەرمانڕەوایی لەئەستۆیە، وە بەردەوام دەبێت لەسەر تواضعو خۆ بەکەم گرتن لەگەڵیاندا.

دووەم: خۆی بەجێبەجێکاری فەرمانەکانی خوادا دەنێت وگوێڕایەڵیکردنیشی بەتەواوکاری گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، وە بەپێویستی سەرشانی خۆی دەزانێت چاودێری ژێر دەستەکانی بکاتو بەشێوەیەکی چاك پابەند بێت لەسەر یاسای فەرمانکردن بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە.

سێهەم: وە خۆی پابەند دەبێت بەدادپەروەریەوە بەبێ ئەوەی گەورەو بچوکی لێدەربکاتو، یان بەبێ جیاوازی لەنێوان گەورەی بچوك یان بەهێزو بێ هێزدا بکات.

وە بەم سیاسەتە روونو گوتارە ڕاستەوخۆیە لەنێوان لێپرسراو ژێر دەستەکانیدا خەڵکی ئاسودەو دڵنیا دەبن وە خۆشەویستیو متمانە لەنێوان فەرمانڕەواو جەماوەردا دێتە دی.

وە بەڕێوەبردنی تازەی ئەمڕۆ بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەبێت لێپرسراو هەڵگری سیفەتی ئاراستەکردن بێت، وە ئەوەی نەتوانێت خەڵك ئاراستە بکات شایستەی لێپرسراویەتی نییە. وە یەکێك لەزاناکانی بەڕێوە بردن دەڵێت: ئەو کەسەی لەتوانایدا نەبێت بۆچوونەکانی بۆ خەڵکانی تر راڤەو روون بکاتەوە ناگونجێت بکرێتە لێپرسراو یان سەرۆك.

## ١١-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو سیفەتی ڕاوێژکردن ( المشاورە ):-

لەلای زاناکان و دادوەران نەخۆشی بۆچوون (الرأی) بریتییە لە ئارەزوو خۆپەسەندی، و ئەوەی تەنها پشت بە بۆچوونی خۆی ببەستێت تووشی نەهامەتی دەبێت.

ئەم ووتەیەش لەسەر تاکی ئاسایی و کەسی لێپرسراودا جێبەجێ دەبێت وەك چۆن لەسەر لێپرسراوی بەڕێوەبردنە،وە هەر کەسێکی تر کە تەرخان کرابێت بۆ ئەنجام دانی کارێك جێبەجێ دەبێت.

ئەوەی لە ئەستۆی لێپرسراودایە پێویستە تەنها پابەندی بۆچوونی خۆی نەبێت،وە ئەوەی تەنها بۆچوونی خۆی وەرگرێت ئەوە مافی خەڵکانی تری پێشێل کردووە و کەمتەرخەمی کردووە لە ئەرکەکانیدا.

ئیسلام چاودێری فەرمانی ڕاوێژکردنی کردووە لەنێوان موسڵمانانندا وە کردوویەتی بە سیفەتێکی پێویست بۆ موسڵمانان وە فەرمانی بەگشت نەتەوەی ئیسلام کردوە لەخۆدی پێغەمبەرەوە ﷺ وەك خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت:- (فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)(آل عمران: من الآية١٥٩)

واتە: (ئەی محمد چاوپۆشیان لێبکەی لێیان ببورە داوای لێخۆشبونیان بۆبکە وە ڕاوێژیان پێبکە لە فەرمانەکانندا، و ئەگەر بڕیارت دا کارێك ئەنجام بدەی پشت بەخوا ببەستە چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن. وە خوای گەورە باسی باوەڕداران دەکات دەفەرموێت (وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ) (الشورى:٣٨).

واتە: (ئەوانەی بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دەچن وە نوێژەکانیان بەچاکی و ڕاستی ئەنجام ئەدەن وە کاروباریان هەردەم

بەپرس و ڕاوێژکاری دەکەن ڕلەوەی کە پێمان بەخشیون بەختی دەکەن لەڕێی خودا).

-ئیبن عطیة- کە یەکێکە لە زاناموسڵمانەکان دەڵێت: ڕاوێژ یەکێکە لە بنچینەکانی شەریعەت وە یەکێکە لە یاسا بەرزو سەرەکییەکان، ئەوەی هەڵناسێت بە پرس و ڕاوێژکردن لەگەڵ خەڵکی زاناو دینداردا لابردنی پێویستە (واجبە) ئەمە گومانی تێدا نییە، خوای گەورە باسی باوەڕدارانی کردووە کە دەفەرموێت:

(وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)(الشورى: من الآية٣٨) واتە: فەرمانتان بەڕاوێژ بێت لەناو یەکتردا. (ئیبن خویز منداد) دەڵێت: پێویستە لەسەر (والیەکان) ڕاوێژ بە زاناکان بکەن لەو شتەی کە نایزانن وە لەو شتەی کە گومانیان تیادا بۆ دروست بووە لە فەرمانەکانی ئاییندا و ئاراستەکردنی سوپادا ئەوەی کە پەیوەستە بە شەڕو ئاڕاستەکردنی خەڵکی و ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بەرژەوەندییەکانیانەوە هەروەها ئاراستەکردنی فەرمانبەران و وەزیرەکان و کرێکارەکان هەموو ئەوانەی کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندی وڵات و ئاوەدانکردنەوەوە هەیە.

ڕاوێژکردن بەم پێیە وەك لەقسەی جوانی عەرەبدا هەیە کە دەڵێت (ما ندم من استشار ولاخاب من استخار) واتە: (هەرگیز ئەوکەسەی ڕاوێژدەکات پەشیمانی تووشی نابێت و ڕاوێژلێکراویش هەرگیز تووشی پووچەڵی نابێتەوە) وە شێخ الاسلام (ابن تیمیە) دەڵێت: فەرمان ڕەوا لەڕاوێژکردن دەوڵەمەند نابێت، بەڵکو بەردەوام پێویستیەکی زۆری پێیەتی. بێگومان خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت:

(فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)(آل عمران: من الآية١٥٩) واتە: چاو پۆشی لێبکەن (لەکەمو

گورِپـەکانیان) لێیـان ببـورە و داوای لێخۆشـبونیان بـۆ بکــە، لــەکارو فەرمانـەکاندا ڕاوێژیـان پـێبکە، ئەگەر بڕیـارت دا پشـت بـەخوا ببەستە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن.

وە پێغەمبـەر لـە هـەموو کـەس زیـاتر ڕاوێـژی کـردووە لــەکارو فەرمانەکاندا. وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن: ڕاوێژبکە بەو کەسەی کە ئـەزمونی وەرگرتـووە لــەکاردا چونکــە ئـەو بۆچوونــی خـۆی پێـت دەبەخشـێت بـە خۆڕایـی و بـەبێ بەرامبـەر کـە زۆر لای خۆشەویسـتە و ماندوو بووە لە بەدەست هێنانی ئەو ئەزمونەدا.

عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) لە خەلافەتەکەیدا یەکێك بووە لەو کەسانەی کە فەرمانی بەڕاوێژکردووە، وە دادەنرێت بەیەکـەم کەس بە چەسپاندنی ڕاوێژ،وە سـفیانی ثـوری دەڵێـت (پێویسـتە ئـەو کەسەی ڕاوێژی لەگەڵدا دەکەیت، کەسێکی لەخوا ترس و دڵ و دەروون پاك و خاوەن بڕوایەکی بەهێز بێت).

وە ڕاوێـژ بـەم تێگەیشـتنە سـەرەنجامێکی گـەورەی دەبێـت وەرەنـگ دەداتەوە لەسەر تاك و کۆمەڵ بەم شێوەیەی خوارەوە:-

١-ڕاسـتی بـۆ لێپرسـراو روون دەبێتـەوە لـەدوای گـوێ گرتنـی لـە بۆچـوون و دەمەتـەقێ و هێنانـەوەی بەڵگـەکان و جیاکردنــەوەیان و وەرگرتنی چاکترین و ڕاسترین بۆچوون.

٢-بەشداریکردنی لێپرسراو لەگەڵ هاووڵاتی و شوێن کەوتەکانیدا لە بەجێ هێنانی ئەمانەتی لێپرسراویەتیدا کە ئەمەش وایان لێدەکات کە دڵنیـابن لــە هەڵسـوکەوت و فەرمانــەکانی وە متمانــەیان بەقســەو ئاراستەکردنەکانی هەبێت.

٣-ڕاوێـژ پاڵنەرێکـە بـۆ یـەك بۆچـوون، وە دوورخـەرەوەی مەترسـی ململانێ و دووبەرەکییە.

٤-بەڕاوێژکردن سوود وەردەگیرێت لە خاوەن ئەزموونەکان وە سود بەخش دەبێت لێپرسراو لەدانانی ئەو کەسانەی کە ئەزمونیان هەیە وەیان ئەوانەی کە خاوەن ڕابردوویەکی باشن لەژیاندا.

وازهێنان لە ڕاوێژ بریتییە لە خراپی و گەندەڵی، وە لەبەر گرنگی سیفەتی ڕاوێژکردنی لێپرسراو خوای گەورە باسی (وسف) باوەڕدارانی پێکردووە و پاداشتی بۆ ئەوانە داناوە کە پابەندن پێوەی، هەروەها سەرپێچی کردنی لادانە لە فەرمانی خوای گەورەیە کە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڕاوێژکردن لەگەڵ ئومەتەکەی کە ئەویش فەرمانی کردووە بە ئومەتەکەی کە لە نێوان یەکتریدا راوێژ بکەن. هەروەها وازهێنان لەڕاوێژ دەبێتەهۆی پەیدابوونی چەوساندنەوە و ستەم و زۆرداری ئەمەش ئەوەی لێ بەرهەم دێت کە لێپرسراوو شوێنێکەوتوەکانی لەیەك ناگەن و ململانێیەکی زۆر بڵاودەبێتەوە.

*   *   *

## ئاسودەیی مرۆڤ

حەکیمێك دەڵێت ئاسودەیی مرۆڤ لە چوار شتاندایە:

ئاسودەیی رووح.. لە کەمی گوناهدایە
ئاسودەیی دڵ.. لە کەمی خەیاڵاتدایە
ئاسودەیی زووبان.. . لە کەمی قسەکردندایە
ئاسودەیی لەش.. . لە کەمی خواردندایە

## ١٢-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو.. دیاریکردنی پسپۆرییەکان (إختصاصات):-

لەهەڵە دیارو بڵاوەکان لە بەڕێوەبردندا، دابەش نەکردنی ئەرکەکانە بەسەر کرێکارەکاندا بەهۆی ئەمەوە کارێکی زۆر دەکەوێتە دەست لێپرسراوی یەکەم، و بەهۆی کەمی ئەو لێپرسراوانەی چاودێری فەرمانەکان دەکەن. لێپرسراوی یەکەمیش ناتوانێت فریای گشت کارو فرمانەکان بکەوێت. و کەمتەرخەمی و سەرلێشێواوی بڵاودەبێتەوە.

ئەمە هەڵسوکەوتێکی هەڵەیە لەکاری بەڕێوەبردندا وە لەزانستی بەڕێوەبردنیشدا ئەمە ڕەت دەکرێتەوە چونکە لەبواری کرداریو تاقیکردنەوەی ڕۆژانەدا پووچەڵ بۆتەوە. و بەپێی تاقیکردنەوەی زانستی بەڕێوەبردن دابەشکردنی کارو دیاریکردنی بەشەکانی یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتن، و بێگومان دیاری نەکردنی پسپۆڕەکان و دابەش نەکردنیان دەبێتەهۆی ڕوودانی ناخۆشی لەنێوان فەرمانبەرکاندا وە هەندێکیان دەست درێژی دەکەنە سەر سنوری پسپۆڕەکانی تر.

ووردبوونەوە و پێزانیمان لە ڕێکوپێکی گەردوون و بەڵگە جوانەکانی خودا دەبینیت کە بەرنامەیەکی پسپۆری جوانی تێدایە لە دانانی پسپۆری بۆ خاوەنە لێهاتووەکانیان، وە ئیسلام زۆر ڕێزی بۆ داناوە و کردوویەتی بە بەڵگە روون و ئاشکراکانی (ایات البینات) لە خودی مرۆڤ و زانست دا.

سونەتی خوا لەکوێدا ئەرکەکانی سنووردار و دیاریکراو کردوون چونکە ئاسمانەکان وەزیفە و ئەرکی خۆیان هەیە وە دانیشتوانی خۆی

هەیە کە بریتین لە فریشتەکان کە ئەرکی خۆیان هەیە، وە زەویش ئەرکی خۆی بۆ داناوە، و هەروەها دانیشتوانی خۆشی هەیە وە ئەستێرەکان ئەرکی خۆیان هەیە وە شاخەکان بۆ زەوی ئەرکی خۆیان هەیە وە رووبارەکان بۆ زەوی ئەرکی خۆیان هەیە هەروەها دەریاکانو وە رۆژو شەویش رۆڵی خۆیان هەیە وە هەروەها گیانداران ئەرکی خۆیان هەیە وە مرۆڤیش ئەرکی خۆی هەیە.

ئەگەر بیربکەینەوە لە ئایەتەکانی خوای گەورە دەبینین ئاڕاستەکانی (توجیهات) ئیسلام ڕوون و ئاشکرایە لەڕێزگرتن لە پسپۆڕی و دابەشکردنی کارو دیاریکردنیان، ئەوە یوسف (علیەالسلام) داوا لە عزیزی میسر دەکات کاری بۆ دیاری بکات وەك لێپرسراوی دارایی و گەنجینەکانی وڵات.

چونکە لەو بوارەدا زانیاری هەیە و دەستپاکیشە وەك دەفەرموێت: (اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ) (یوسف:٥٥).

واتە: یوسف فەرمووی بمکە بە لێپرسراوی سامانی ئەم وڵاتە چونکە لەخۆم ڕادەبینم کەشت بپارێزم وە لە پاراستنی زانیاریم هەیە.

وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لێپرسراویەتی نەداوە بەکەس لەسەرەتادا، بەڵکو گەڕاوە لەنێوان پیاوەکانیدا تاکو کەسێکی گونجاو بدۆزێتەوە تاکو بیخاتە سەر ئەو کارەی کە گونجاوە بۆی وەکو چۆن (ئیبن مەسعود) لێپرسراوی ڕاخەرو .... وە (حوذیفەی کوری یەمان) خاوەنی نهێنی‌یەکانی بوو وە (ئەبوبەکری صدیق و عمری کوڕی خەتاب) وەك ڕاوێژکاری وابوون. وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ کارێکی بۆ یەکێك لە

سەرکردەکان دیاری دەکرد پێی دەفەرموو:- (انفـع الخيـل عنـا بـالنبل لا يأتونا من خلفنا وإن كانت لنا أو علينا)[٢٤]

واتە: لەئەسپەکە بدە بەنەرم و نیانی با نەیاتەسەرمان لەدواوە با هی خۆمـان بێـت یـان هـی خـەڵکی تـر، واتـە بەشـێوەیەکی دادپـەروەر هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ خۆت و کەسانیتردا لەخێرو شەردا.

بێگومان پێشەوای موسڵمانان و لێپرسراوەکانیان گرنگی پسپۆری و دیـاریکردنی ئـەرکی خـەڵکانیان بـەپێی زانینـی کارەکانیـان هەسـت پێکردووە وەك (خالدی کوری وەلید) کە (ئیبن کثیر) لە پەرتوکی (البداية و النهايـة) دا باسـی دابەشـکردنی ئەرکـەکانی کـردووە لـە شـەڕی (یەرموکدا) کاتێك (خالدی کوڕی وەلید) سەرکردەی ئەو جەنگە بوو.

دەڵێـت (کـاتێك سـوپاکە دەرچـوون (٣٦-٤٠) کـردوس بـوون هـەر کردوسە هەزار کەس بووەهەر هەزارەو ئەمیرێکی پێ سپاردبوون. (ئەبو عوبـەیدە)ی لەناوەڕستی سوپاکە دانابوو لای چەپـەوە (یـەزیدی کـوڕی ئەبو سـوفیان) ئەوانـەی لـە پێشی پێشـەوە بوون پێشـەنگیان پێدەووترا بەسەرۆکایەتی (قبابی کوڕی ئەشیم) بوو .

وە تیرهاوێژەکان (عبدالله کوڕی مەسعود) ئەمیریان بوو وە قاضی سوپاکە (ئـەبو دەرداء) بـوو بـانگ بێـژو ووره‌بەرزکـەرەوەی سـوپاکە (مقـدادی کـوڕی ئەسوەد) بوو کە سورەتی (ئەنفال) و ئایەتـەکانی (جیهادی) بەسـەر سوپاکەدا دەخوێنـد وە(خـالد) خـۆی لـە پێشـەوەی سـوارچاکەکاندا لەناوەڕاسـتی سوپاکەدا بوو. کە ڕێنیشاندەر و ئاراستەکارو دابـەش بوونـی سـوپاکە گشتی لەسەر ڕای ئەو دەجولاًنەوەردەجەنگان.

---

[٢٤] (لە شهزيب)ی سیرەی ئبن هشام دا هەیە، ل ١٧٩ دار احياء التراث العربي

لێپرسراوی لێهاتوو بەم شێوەیە دەبێت کە کارەکان دیاری بکات بەپێی پسپۆران پاشان دابەشکردنی کارەکان لە نێوان پیاوەکانیدا وە ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بجوڵێتەوە ئەوا لە کارەکەیدا تووشی هیلاکی و ڕووخان دەبێت.

*   *   *

## ١٣-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو – سیفەتی دڵسۆزی (إخلاص):-

سیفەتی دڵسۆزی یەکێکە لە سیفەتە سەرەکی‌یەکان کە پێویستە بۆ هەر کارێك کە موسڵمان پێی هەڵسێت، مرۆڤی باوەڕدار لە هەر کارێکدا کە بە ئەنجامی دەگەیەنێت مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت‌و لەسەروو هەموو مەبەستێکی تر بەوەی دانێت، چونکە بچوکترین پلە (منصب) تاکو بەرزترین پلە لە ئاینی ئیسلامدا دەبێت تەنها بەنیەتی دڵسۆزی بێت بۆ خوداو مەبەستی بەرزکردنەوەی ووشەی (الله) بێت.

ئەگەر لێپرسراو لەکارەکەیدا مەبەستی تەنها ڕەزامەندی پەروەردگار بێت و مەبەستی کەسێکی تر نەبێت، و خۆی تەنها بۆ خوا بڕەخسێنێت، بەم جۆرە کارەکەی بەرەو چاکە دەبات لە نهێنی و ئاشکرادا وە چاودێری پەروەردگارت دەکان و بەرژەوەندیەکانی خەڵکی جێ‌بەجێ دەکات خوای گەورە دەفەرموێت:-

(وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ) (البينة:٥).

واتە: فەرمانیان پێ نەدرابوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن لەکاتێکدا کە بەدڵسۆزی دینداری بکەن و دوور بن لەهەموو

بیروباوەڕێکی خوارو خێچ وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە بێگومان ئەمەیە ئاینی ڕاست.

وە ئەو کەسانەی دڵسۆزن بۆ خوا لەکارەکانیاندا پاداشتیان تەنها بەهەشتە خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عن الْهَوَى، فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى) (النازعات: ٤٠-٤١).

واتە: ئەو کەسەی ترسا بێ لە پەروەردگاری و جڵەوگیری نەفسی خۆی گرتبێت لە ئارەزووی خراپ، بێگومان بەهەشت جێگایەتی.

ئەمە دادەنرێت بەگەورەترین پاڵنەر بۆ موسڵمان تاکو بەڕێکوپێکی کارەکەی ئەنجام بداو چاکەی تیا بکات. وە لە پێشەوایەتی بەڕێوەبردنی تازەدا داکۆکی زۆر لەسەر گرنگی دڵسۆزی کراوە لەکارو فرمانەکاندا، وە لەجیهاندا بەگەورەترین هێز دەژمێردرێت بۆ سەرکەوتن لەکارو پرۆژەکاندا، بەلاَم بەوە دەست هەڵناگرێت کە دڵسۆزی تەنها لەساتی ئاشکرا یان لەکاتی بینیندا وە یان لەکاتی چاودێری خەڵکانی تردا بەبێ گرنگیدان بە دڵسۆزی تەواوەتی و هەمەلایەنە، کە هاوەڵی مرۆڤ بێت لە نهێنی و ئاشکراکانیداو لە شەوو ڕۆژیدا.

ئیسلام بە بەرنامە ڕێکو جوانەکەی هەڵدەستێت بەدروست کردنی ئەو مرۆڤەی کە داوای سۆزو بەزەیی تەنها لە پەروەردگاری دەکات وە دەترسێت لە سزاکەی وە پارێزگاری خۆی دەکات لەهەر کوێیەك بێت و لەگەڵ ڕاستیدا دەڕوات و چاودێری خوای گەورە دەکات لەگشت هەڵسوکەوت و کردارەکانیدا لەنهێنی و ئاشکراو شەوو ڕۆژیدا.

وە کەسانێکی زۆر هەن لەدامو دەزگاکانماندا کاتێك دەبنە لێپرسراو بەسەر جێگەیەکەوە گوێ نادەن بە دڵسۆزی و دەیانەوێت لەوێوە

دەستبگرن بەسەر ماڵو پارەو ساماندا و تەنها پارێزگاری لە پلەوپایەی خۆیان بکەن، ئەمەش دەبێتەهۆی زۆربوونی خیانەت لە نێوان کارمەندەکاندا وە زۆربوونی دزەکان و بەرتیل خۆرەکان وە مافی خەڵکی بەنارەوا لەناو دەچێت. پاشان لەدەستدانی بەرژەوەندی خەڵکی.

وە ئیسلام لە ئاراستەکانیدا (توجیهات) لەدانانی لێپرسراودانە وەستا وە بەوەی کە تەنها چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکەن یان باوەرهێنانێکی سادەی هەرەمەکی بەڵکو هەڵدەستێت بەهەوڵ و تێکۆشانی زۆر لە شایەتی خەڵکی لەسەری وە بەردەوامبوونی لەسەر گوێ رایەڵی بۆ دانانی لێپرسراویەتیو لەپێناو دابین کردنی ئەم جۆرە لێپرسراوانەدا ئاگاداری کردوینەوە لە فرۆفێڵی دو ڕووەکان کە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ (المنافقون: ٤).

واتە: کاتێك بیان بینیت بەقەبارەی زلیان سەرسامت دەکەن، ئەگەر قسەبکەن گوێ یان بۆ دەگریت، دەڵی‌ی کۆتەرەداری هەڵپەسێردراون ئەوەندە لەترس و بیمدا ئەژین هەر بانگێك و باسێك بێتەپێشەوە وا دەزانن باسی خۆیانە، هەر ئەوانن دوژمن، خۆتیان لێ بپارێزە ئەواش خوا لەناویان بەرێت ! چۆن ڕوو وەردەگێرن؟! بەدڵسۆزی لەکاردا زۆر بەرژەوەندی جێبەجێ دەکرێت لەوانە پاداشتی چاك (فمن كان هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله)[٢٥]

---

[٢٥] ئەم فەرمودەیە (متفق علیه) یەوە لە ئەبی داود و ترمزی - و نسائی و ئیبن ماجه و لەعومەری کوڕی خەتاب و لەحلیەی ئبی نعیم و دار قطبی لە غرائب مالك لە ابن

واته: ئەوەی کۆچکردنەکەی تەنها لەبەر خاتری خواو پێغەمبەرەکەی بێت بێگومان ئەو کۆچکردنە تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی و خوای گەورە پاداشتی دڵسۆزییەکەی دەداتەوە.

وە هەروەها دەبێتە هۆی فەڕو بەرەکەت و زیادبوونی چاکە: ﴿ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾(الطلاق: من الآية٢-٣).

واتە هەرکەسێك لەخوا بترسێت و پارێزگاری خۆی بکات خوا دەرووی لێدەکاتەوە لە شوێنێکەوە بۆی دەنێرێت؛ کە بەهیچ شێوەیەك لەبیری ئەودا نەبووە وە هەروەها دڵسۆزی هۆیەکە بۆ زاڵبوون بەسەر هەواو ئارەزووەکاندا، بێگومان هەواو ئارەزوو دەتبات بۆ خودپەرستیو دوورکەوتنەوە لە خەڵکانی تر.

* * *

قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):

**( من أحب لله، و أبغض لله، و أعطى لله، و منع لله فقد استكمل الايمان )**

---

سعید و ئیبن عساکر لە ئەمالیە لە ئیبن و رشید عطار تخریجی کردووە لە انسەوە.

(وە تەماشای صحیح جامعی البانی) ژمارە (٢٣١٩).

## ١٤-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو... سیفەتی ڕاستگۆیی (الصدق):-

لەو هەڵە زۆر بڵاوانەی لەکاری لێپرسراوان و بەڕێوەبەرەکاندا هەیە کەوتنە ناو پۆخڵی درۆکردنە، وە ئەمەش لەکەسێکدا دیاری دەدات کاتێك کە پەیمان و بەڵێنەکانی ناهێنێتەدی وە درۆو فێڵ لە بەرژەوەندی گشتی دەکەن، بەڵام لێپرسراوێتی و فەرمانبەرێتی خەڵك بەم شێوەیە نابێت؛ چونکە درۆ سیفەتێکی زۆر خراپە لەهەر کەسێکدا بێت چ جای ئەوەی کەلە لێپراسراودا هەبێت درۆ بەرەوکاری چاکی نابات تەنها بەرەو گوناهو تاوان نەبێت وە هیچ سوودێك ناگەیەنێت و هەروەها بەرەو هیچ مەبەستێکیشی نابات تەنها نەهامەتی و سەرشۆڕی نەبێت. لەبەرئەوە گرتنەبەری ئامراز لەلای موسڵمان بەڵگە نیە بۆ گەیشتنی بە مەبەست..

درۆ لە سیفەتی دوڕوو کافرەکانە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ) (المنافقون: من الآية١).

واتە: خوا شایەتە کە ناپاك و دوڕووەکان درۆزنن و درۆ دەکەن و باوەڕیان بەتۆ نییە.. هەروەها دەفەرموێت (لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَنْ صِدْقِهِمْ وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً أَلِيماً) (الأحزاب:٨).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خوا پرسیار دەکات لە ڕاستگۆیان دەربارەی ڕاستیەکەیان وە بۆ کافرانیش سزاو تۆڵەیەکی بە ئێشی ئامادەکردووە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی داوا کراوە لە موسڵمان تەنها ڕاستگۆیی‌یە وە ئەوەی زیاتر پێویستە پابەندی بێت پێوەی موسڵمانی لێپسراوە چونکە درۆکردن زۆر ناشیرین‌و قێزوونە بۆ کەسانی لێپرسراو بۆی وەك لە خەڵکانی تر ئەمەش بەهۆی ئەم هۆکارانەی خوارەوە:-

یەکەم: لێپسراو پێشەوایە بۆ شوێنکەوتووەکانی کاتێ بینیات درۆ دەکات ئەوانیش چاوی لێدەکەن ئەوا دەبێتە پێشەوا (قدوة) یەکی خراپ بۆیان، بەڵام ئەگەر ڕاستگۆ بوو لە مامەڵە و هەڵسوکەوتدا خەڵکیش بەرواى پێدەکەن و چاوى لێدەکەن ئەوا دەبێتە پێشەوایەکی باشی ونمونەیەکی جوان بۆ چاولێکردن.

دووەم: لێپسراو لەپلەوپایەکدایە پێویستی بەدرۆکردن و غەشکردن نیە چونکە ئەو کەسەی پەنا دەبات بۆ درۆکردن ئەوەیە کە خۆی دەترسێت لەسەرزەنشت کردن و هەرەشەو لابردن ، ئەوەی کە پێویستە لەسەر لێپرسراو ئەوەیە کە دەبێت خەڵکی لێ بترسن چونکە خاوەنی هێزو دەسەڵاتە، ئەگەر کەوتە درۆکردن فیزدەکات و درۆکردنەکەی بەکەم وەردەگرێت و خۆ بەگەورە نیشان دەدات کە ئەمەش سیفەتێکی زۆر خراپ و قێزەونە.

سێیەم: ئەگەر لێپسراو درۆی دوبارە کردەوە ئەوا بەتەواوی متمانەی خەڵکی لەدەست دەدات و کاتێ قسە بۆ خەڵکی دەکات قسەکانی بەڕاست نازانن، هەروەها کاتێ پەیمان دەدات پشت بە پەیمانەکانی نابەستێت لەپێناو ئەمەدایە کە ئیسلام ئاگاداری کردوینەتەوە لەدرۆ و پەیمانی لێپرسراوو بەتووند ترین و گەورەترین سزا چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ثلاثة لايكلمهم الله يوم القيامة ولايزكيهم و لاينظر اليهم ولهم عذاب اليم الشيخ زان والملك الكذاب و عائل مستكبر)[٢٦]

---

[٢٦] امامی مسلم و نسائی ڕوایەتیان کردووە لەئەبی هریرە وە وە لە صحيح جامعی ئەلبانی دا بە ژمارە (٣٠٦٩).

واتە: سێ کۆمەڵ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پاکیان ناکاتەوە و تەماشایان ناکات وە ئازارێکی سەختیان بۆ دانراوە ئەوانە بریتین لە پیرێکی زیناکەر وە پێشەوایەکی درۆزن وە هەژارێکی خۆ بەزل زان.

ئیمام نەوەویی لەسەر ئەم فەرموودەیە بۆچوونێکی هەیە کە دەڵێت: پێشەوا ناترسێ لە شوێنێکەوتووەکانی وە پێویستی بە ڕووپامایی و ماستاوکردن لەگەڵ کەسدا نی یە تاکو بەمە پلەو پایەیەک یان بەرژەوەندیەکی دەستکەوێت بێگومان پێشەوا بەتەواوەتی دوورە لەدرۆوە. و ڕاستگۆیی لە حوکمی ئیسلامدا بریتییە لە پارانەوە بۆ خاوەنەکەی لە دنیاو قیامەتدا، و نموونەی دنیا: وەکو چیرۆکی کعبی کوڕی مالیك کاتێ لەجەنگی (تبوك) دا دواکەوتن بەبێ عوزر وە هەواڵیان دایە پێغەمبەر ﷺ کە کعب عوزری نیە بە پێچەوانەی ئەوانیتر کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر هەریەکەیان درۆیەکیان کرد بەعوزر بۆ دواکەوتنەکەیان بەڵام خوای گەورە هۆی دواکەوتنەکەیانی بەئایەتێك ڕونکردەوە کە بووە هۆی دیاریکردنی دواکەوتنەکەیان، لەم ڕوانکردنەوەیەدا بێتاوانی کعب دەرچوو چونکە درۆی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نەکرد، و کاتێ تۆبەکەیان گیرابوو کعب هاتە خزمەت پێغەمبەر و ووتی خوای گەورە ڕزگاری کردم بەڕاست گۆیی یەکەم وە ئەوانی تر بەدرۆ بەهانەیان دروستکرد بەدوور ڕوو (منافق) دەرچوون. نمونەی قیامەت: ڕاستگۆیی هۆکارە بۆ ڕزگاربوونی خاوەنەکەی بەپێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت (إن الصدق ليهدي الى البر وان البر يهدي الى الجنة وان الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقاً الكذب يـهدي

الى الفجور وان الفجور يهدى الى النار وان الرجل ليكذب حتى يكتب عندالله كذاباً)[27]

واتە: ڕاستگۆیی ڕێنمونیکەرە بۆ چاکە وە چاکەش ڕێنمونیکەرە بۆ بەهەشت، وە ئەو پیاوەی بەردەوام دەبێت لەسەر ڕاستگۆیی تاکو لای خوا بە ڕاستگۆ دەنوسرێت، بێگومان درۆش ڕێنمونیکەرە بۆ خراپە وە خراپەش ڕێنمونیکەرە بۆ ئاگر وە ئەو پیاوەی بەردەوام بێت لەسەر درۆ کردن تاکو لای خوای گەورە بە درۆزن دەنوسرێت.

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕاستگۆیی هۆیەکە بۆ سەرکەوتنی کاری لێپرسراو و ڕێگەشە بۆ بەدەستهێنانی متمانەی خەڵکی، خوای گەورە دەفەرموێت:- (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ) (التوبة:119).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستیدا بن.

* *

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ)

---

[27] (متفق عليه) لە ابن مسعود وەرگیراوە، لە صحیح جامعدا هەیە بە ژمارەی (١٦٦٥).

### ١٥-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو.. دانان بەهەڵەدا (الاعتراف بالخطأ):-

ئەوەی کار بکات هەڵەدەکات، هەر کاتێ لێپرسراو پلەو ئەرکی زۆربوو هەڵەش زۆر دەکات، ئیسلام ڕێزی لەسروشتی (طبعیة) مرۆڤ گرتووە و دانی ناوە بە کەمتەرخەمی مرۆڤ بەپێی ئەم فەرمودەیە (كل بني أدم خطأ وخير الخطائين التوابون)[٢٨].

واتە: هەموو نەوەی ئادەم هەڵە دەکەن و چاکترین کەسانێك ئەوانەن کە دەگەڕێنەوە و تۆبە دەکەن.. بەڵام زۆر عەیبە بۆ مرۆڤ کە دان نەنێت بە هەڵەکانیدا وە بەردەوام بێت لەسەری و سووربێت لەسەر هەڵەکەی بەتایبەتی ئەو کەسە ئەگەر لەسەر ئاستی لێپرسراوەتیدا بێت ئەوە زۆر عەیبترو خراپترە. ئەگەر لێپرسراو دان نەنێت بەهەڵەکەیدا ئەوا لە ئەنجامی ئەوەدا کۆمەڵێك خراپی لێدەکەوێتەوە لەوانە لەدەستدانی دەسەلات و ڕێزی لێپرسراویەتیەکەی هەروەها خۆی بە گەورە دەزانێت ئەگەر ڕاستی وەربگرێت و بەچاوی سووك تەماشای خەڵك دەکات و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الكبر بطر الحق وغمط الناس)[٢٩]

واتە: خۆ بەگەورە زانین داپۆشەری حەقەو بەسوك زانینی خەڵکە. هەروەها کرێکار و شوێنکەوتووەکان بەسووك تەماشای ئەو لێپرسراوە دەکەن کە بەردەوام دەبێت لەسەر خراپە کردن لەدوای فراوان بوونی

---

[٢٨] ئەم حیشە (حسن)ە امام احمد ڕیوایەتی کردووە لە مسندەکەیدا و ترمذي و ابن ماجة والحاکم لە مستدرك لە ئەنسەوە.

[٢٩] تەواوکەری ئەم فەرمودەیە (لایدخل الجنة من کان في قلبه مثقال ذرة من كبر) قيل: ان الرجل يحب ان يكون ثوبه حسناً ونعله حسناً قال: ان الله جميل يحب الجمال الكبر بطر الحق و غمط الناس). رواه مسلم عن ابن مسعود وهو في صحيح جامع رقم (٧٦٧٤).

دەسەڵاتەکەی. وەبەردەوامبونی لێپرسراو لەسەر خراپە (باطل) دەبێتەهۆی دابەزینی بەڵاو موسیبەت (الكوارث) بۆ سەر گەل، وەك چۆن لەعومەری کوڕی خەتابیان پرسی ئایا خوای گەورە لەدوای ئەم ئاوەدانی و خۆشیەی ئیسلام ناخۆشی و نەهامەتی دێت، فەرمووی بەڵێ کاتێ ئەگەر خراپەکار (فاجر)ەکان خۆیان بەگەورە بگرن بەسەر پیاوە چاکەکاندا ؟

واجب وایە کاتێ لێپرسراو هەڵەی کرد لەسنوری تێکۆشانیدا (اجتهاد) پێویستە لەسەری دان بنێت بەهەڵەکەیدا و بگەڕێتەوە سەر ڕاستی ئەگەر وای کرد ئەوا متمانەی خەڵکی دەگێڕێتەوە بۆ خۆی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (اذا حكم الحاكم واجتهد فاصاب فله أجران و اذا حكم فاجتهد خطأ فله أجر واحد)[٣٠]

واتە: ئەگەر فەرمانڕەوایەك دوای تێکۆشانێك (اجتهاد) فەرمانێکی داو فەرمانەکەی لە جێگەی خۆیدا بوو ئەوا دووجار پاداشت وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر لەدوای تێکۆشانێك هەڵەی کرد ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە.

لەنمونەش بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری خەڵکی مەدینەی دەکرد لەسەر قەڵەم کردن و پیتێن کردنی دارخورماکان پیێ فەرموون وازی لێبهێنن گومانم وایە هیچ پیێ زیاد ناکات (ما اضن يغني ذلك شيئاً) کاتێ ئەهلی مەدینە وازیان لە پاککردن و پیتێنەکەهانی و وەختێ کاتی بەرگرتنیان هات تەماشایان کرد خورماکانیان بەری

---

[٣٠] رواه احمد وبخاري ومسلم وأبو داود نسائي ابن ماجه عن عمر بن عاص كذلك عن ابى هريرة وهو رقم ٤٩٣ في صحيح الجامع.

نەگرتووە هەواڵیان بە پێغەمبەر دا فەرمووی (ان كان ينفعهم ذلك فليصنعوه فـاني إنما ظننت ظناً فلا تؤاخذوني بالظن ولكن إذا حدثتكم عن الله فخذوا به)[31]

واتە: کاتێك سودتان لێ وەربگرتایە بەردەوام دەبوون لەسەری بەڵکو من تەنها گومانم برد وە گومانی من وەرمەگرن بەڵکو تەنها کاتێك باسی خواتان بۆ دەکەم وەریبگرن و پابەندبن پێوەی لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (انتم أعلم بامر دنياكم)[32]

واتە: ئێوە شارەزاترن لەفەرمانی دنیاتاندا.. ئەوەی جێی سەرنجە لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر دانی نا بەهەڵەکەیدا لە ئیجتیهاد کردنەکەیدا وە داوای لێکردن کە چۆنتان کردووە لەوەوپێش وای لێبکەن بەتایبەتی ئەو دارخورمایانەی کە وازتان لێهێناون.

وە خەلیفە ڕاشدەکانیش لەسەر هەمان ڕێچکەو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتن عومەری کوڕی خەتاب لە هەندێك ئاڕاستەکردنەکانیدا (توجیهات) دەڵێت (يمنعك قضاء قضية امس مراجعة اليوم فيه عقلك و هديت فيه لرشدك إن ترجع الى الحق فان الحق قديم ومراجعة الحق خير من التمادي في الباطل).

واتە: هیچ شتێك نییە ڕێت لێ بگرێت کاتێك کە حوکمی ڕووداوێکت داوە ئێوارە وە ئەمڕۆ بگەڕێیتەوە سەر عەقڵ و مێشکی خۆت و ڕێنمونی بکەیت تیایدا تاکو بگەڕێیتەوە سەر حەق بێگومان حەق کۆنەو نافەوتێت

---

[31] رواه مسلم عن طاعة ورقمه (١٤٣٢) في الصحيح الجامع.

[32] رواه مسلم لە ئنس و عائشه وە وە لە صحیح جامعدا بەژمارە ١٤٨٨.

و ـگەڕانـەوە سـەر حـەق چاكـترە لـە تێپـەڕبوون و بـەردەوام بـوون لەسەر خراپە.

زۆر كەس گومان وادەبەن ئەگەر دان بەهەڵە دابنێن دەبێتەهۆی تەریق بوونـەوەیان و شـكاندنیان لەبـەردەم خـەڵكیدا، وە یـان لـەناو خـەڵكیدا سووك سەلیم ببن و ئەمـەش بـەهۆی نـەبوونی لێـهاتوویان (كفائـە) ئـەم جۆرەبیركردنەوانەش گشتی خەیاڵ پلاّویە بەسـەر ئـەو كەسانەدادێت كە هیچ لە لێپرسراویەتی نازانن.

بەڵكو دانـانی لێپرسـراو بەهەڵەكەیدا جۆرێك لـە تـەواضوعی تیایـە دروست دەبێت كە دەبێتە هـۆی بەرهـەمی خۆشەویستی و بەهێزكردنی لێپرسـراوەتیەكەی، و لـەلای ژێـر دەسـتەكانی ڕێـزی زیـاد دەبێـت، وە دەگەڕێتەوە سەر ڕاستی پاشان لە توانایدایە كە كاروبار زۆر باش بكات وە دابینـی بەرژەوەندیە جـۆراو جۆرەكـانی خـەڵكی بێـت وە گـەندەڵی و خراپەكاری بە هـەموو جۆرەكانییـەوە لـەوڵاتدا كـەم بكاتـەوە و بنـەبڕی كات. عەیبو كەمی نییە كاتێ لێپرسراو تێكۆشانێك بكات و هەڵە بكات بەڵكو عەیب ئەوەیە بكەوێتە ناو هەڵەوە بەبێ تێكۆشان بەردەوام بێت لەسەر هەڵەكەی لە دوای ئەوەی كەڕاستی بۆ دەركەوتبێت.

وە لـەو شـتانەی كـە هەڵـەی لێپرسـراو كـەم دەكاتـەوە پابەندبوونـە بەڕێوەڕەسـمو بنـەمای كار وە ڕاوێژكردنـە بـەو كەسـانەی كـە خـاوەنی بۆچوون وە ئەزمونیان هەیە لەوەرگرتنی چاكـترین بۆچووندا هـەروەها بەسـتنی كـۆڕو خـول بـۆ گواسـتنەوەی ئەزمونـەكانیان وە سـود وەرگرتن لە تواناكانیان.

## دووەم: چۆن بەڕێوەبردنی لێهاتووی بەرز دابین بکەین ؟

چۆن دەتوانین بەڕێوەبردنی لێهاتووی (ئیداری) بەرز دەستەبەر بکەین؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەتوانین چەند خولێکی راهێنان بۆ بەرچاو رۆشنی بە ئەنجام بگەیەنین، کە دەبێتەهۆی بەرزکردنەوەی رادەی رۆشنبیری و توانای کرێکارەکان بۆ زیاتر شارەزابوونیان لە کارەکانیاندا،بوەیان بەرزکردنەوەی ئاستی ماددی یان (بەرزکردنەوە و زیاتر کردنی موچەکەیان) وە هەروەها پێداویستی خستنە بەردەستیان بۆئەوەی کارەکە زیاتر بەرەوپێش بڕوات، وە دەتوانین ئەزمونەکان و شارەزایی گەلەکانی پێشوویان بۆ بگوازینەوە بۆئەوەی سوود و کەڵك لە ئیش و کارەکانیان وەربگرن.

ئەم وەڵامانە ڕاستن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا پێویستی بەڕێنمونی و بەر چاو رۆشنی زیاتر هەیە، کە دەبێت چەند خاڵێکی تریان بخرێتە پێش چاو بۆئەوەی کە دەستەبەری لێهاتووی و لێوەشاوەیی بکرێت لەبەڕێوەبردنی بەرزدا ئەمەش بەدەست هێنانی کۆمەڵێك بنەماو فاکتەری گرنگ کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕونیان دەکەینەوە:-

**١-چۆنێتی هەڵبژاردنی کەسەکان بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستو پلەو پایانە:-**

بەڕاستی هەڵبژاردنی کەسانی شایستە و لێوەشاوە بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستەو پلەیە کاریگەری‌یەکی زۆر بەرزی لەناوەڕکدا هەڵگرتووە، تەنانەت بەرەوپێش بردن و دوا خستنیشی هەر پەیوەندی بە چۆنێتی ئەو کەسەوە هەیە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە کە کەسانی لێوەشاوە و لێهاتوو بۆئەو مەبەستە هەڵ ببژێردرێن، لەپێش هەموویانەوە دەبێت ئەو کەسە خاوەنی ڕاستگۆیی و دەست پاکی و جوان ڕەفتاری و زانیاری‌بێت

توانایەکی ناوازەی هەبێت لە وەرگرتنی ئەزموونەکانداو، لەهەمان کاتدا دەبێ هەڵس‌وکەوت و ڕەفتاری بەرامبەر بەکرێکارو ژێردەستەکانی زۆر جوان بێت، وە بتوێتەوە لەکارەکانیدا، بەجوانی کارەکان و گیروگرفتەکان چارەسەر بکات و تێڕوانینێکی واقیعییانەی سەردەمیانەی هەبێت و توانایی چاوەدێری و لێپرسینەوە (حسن المتابعة والمحاسبة) تێدا ڕەنگ بداتەوە، هەست بە لێپرسینەوە و خۆشەویستی کارەکەی و پێشخستنی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی خۆیدا، و هەموو تواناکانی بە دڵسۆزی‌یەوە بهاتەگەڕ و سووربوون لەسەر سوود گەیاندن بەخەڵکی و ئەمانەت‌و چەندانی تریش پێویستە لەو کەسەدا هەبێت کە ئەو کارە گەورەی پێ دەسپێردرێت.

خۆئەگەر بێت‌و ئەو سیفەتانەی کە باسمان کرد یەکێکیانی تێدا نەیەتەدی ئەوە مانای وایە کە ئەو کەسە خیانەتی کردووە بەو لێپرسراوێتی‌یەی کە دراوە بەسەریدا، سەرباری ئەمانەش دەبێت نەرم‌و نیانی بەشێکی زۆری ژیانی داگیر کردبێت، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (عليكم بالرفق ان الرفق لايكون في شئ الا زانه ولاينزع من شئ الاشانه)[٣٣]

واتە پێویستە نەرموونیان بن لەگەڵ خەڵکیدا بێگومان نەرموونیانی لەهەر شوێنێکدا بێت جوانی دەکات، وە لەهەر شتێك دابنرێت ناشرینی دەکات.

خۆ ئەگەر بێت و ئەو کەسە بە پێچەوانەوە بێت و ڕاستگۆ نەبێت‌و کردارو ئاکاری جوان نەبێت‌و دڵ ڕەق و توندوتیژ بێت، ئەوە کارەکانی هەرگیز بەرەو پێش ناچێت‌و دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ خەڵك و

---

[٣٣] رواه مسلم عن عائشة و في صحيح الجامع رقم ٤٠٤١.

کارەکەی هەڵ دەوەشێتەوە، ئەو کاتەش هاوسەنگ و یەکسانی و پێوانەکان پێچەوانەو ئاوەژوو دەبێتەوە و مافی خەڵکی دەخورێ و بەناڕەوا کەسانی تر بەرز دەکرێنەوە و کەسانی تریش نزم دەکرێنەوە، چونکە زانستەکەی لەدەستە داوە ، بێگومان پێچەوانەی زانینیش نەفامی و نەزانی‌یەو مرۆڤیش دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێ.

وبەهۆی نەفامی‌یەوە مافەکان پێشێل دەکرێت، خەڵکانیش ناناسرێن و خواست و پێداویستی‌یەکانیشیان دەکەوێتە ژێر پێشێلکاری‌یەوە، ئەو کاتە گیروگرفت و کارەکانی بۆ جێ‌بەجێ ناکرێت، وە ڕێز لە ڕێزدار ناگیرێت. وە خۆویست و خۆپەرست دەردەچێت.

وە بەرژەوەندی کەسانی نەفام دەخرێتە پێش کەسانی ترەوە، وە چەندەها کاری ناشایستەی تری وا ڕوودەدات، کە خواو پاشان خەڵکیش پی‌ی ڕازی نین.

٢-دەبێت هەموو ئەو کەسانەی کە لەو شوێنەدا کاردەکەن ملکەچ بکرێن بۆ ئەو دەستوور و بەرنامانەی کە دانراون، بۆئەوەی ئیش و کارەکان بەجوانی بەڕێوەبچێت، سەرباری ئەمانەش دەبێ لێپرسینەوە و بەدواداچوون لەبەرچاو بگیرێت.

٣-سوود وەرگرتن لەو خولانەی کە دەکرێنەوە بە مەبەستی بەرەوپێش بردنی ئاستی ڕۆشنبیریان و بۆ بەهێزبوونیان و گۆڕینەوەی توانستەکان و دەرخستنی هێزو توانایان.

٤-جاربەجار بۆ هاندانی کرێکارەکان بەگوێرەی دڵسۆزی لە کارەکانیان پلەیان بەرزبکرێتەوە و هەندێک جاریش پارەو بەخششی زیادەیان پێشکەش بکرێت، بۆئەوەی زیاتر دڵیان بەکارەکەیان خۆش بێت و زیاتر دڵسۆز بن بۆ ئیشەکەیان.

### ٥ ـ وەرگرتنی بنەمای نەخشەکێشان و ڕێکخستن و پەرەپێدان:-

#### ١- پەیڕەوکردنی بنەمای نەخشەکێشان:

نەخێشەکێشان (التخطیط) بەزارەوە زانستی‌یەکەی بریتی‌یە لەو کرداری ڕێکخستنەی کە ئامانجەکەی دانانی نەخشە یە بۆ بەکارهێنانی کەرەستە مادی‌ی و معنویەکان، لەسەر چاکترین شێوەی پێشکەوتوو سەرکەوتوو، وە بەکەمترین نرخ و لەکاتێکی زۆر گونجاو دا بۆ چەند ئامانجێکی دیاری کراو کە لە پێشتردا نەخشەی بۆ کێشراوە و پاشان دەخرێنە ناو بازنەی نەخشەکێشان کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

- دانانی ئامانجەکان و پێوەرەکان.
- دانانی یاساو ڕێو شوێن.
- بەهەند گرتنی ئاینده و هاوکێشەکان.
- بەرنامەی کارو خشتەی کاتەکانی.

ئیسلام بانگمان دەکات بۆ دانانی بەرنامەو کێشانی نەخشە بۆ کارەکانمان وە لەریزی زانستی‌یە بەسوودەکان دانراوە کە ببێتە یاسایەك لە ژیانی موسڵماندا هەر بۆیەش قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە دەکات و گرنگی ئەم نەخشەکێشانەمان بۆ دەردەخات کە دەفەرموێت: (وأعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وعَدُوَّكُم)(لأنفال: من الآية٦٠). واتە: ئەوەندەی لە تواناندا هەیە ئامادەباشی خۆتان بکەن، لەهەموو لایەنەکانی بەهێزیەوە (هێزی ووشکانی، ئاسمانی، دەریایی.....) وە لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ (و هۆکانی گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن ببێت.

(تخطيط) نەخشە دارێژی لە تێگەیشتنی ئیسلامدا زۆر پێویستە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەگوێرەی مەبەستو پێداویستی ڕاست و ڕەوان و داواکراوەو وەردەگیرێت. ئیسلام گرنگی دەدات بە خوێندنەوە و توێژینەوەی نەخشەکێشان لەبەرئەوەی ئامرازێکە بۆ بەرنامە داڕێژی بەشێوەیەکی وردو بایەخدار، کە بەهۆیەوە کارەکان بەرێکوپێکی ڕاپەڕێنرێت.

لەهەمان کاتیشدا دەبێ ئەوە بزانرێت کە لە ئیسلامدا بەرنامەڕێژی و نەخشەکێشان نابینرێت کە مۆرکێکی خەیاڵ پڵاوی وەربگرێت، بەڵکو لەڕوانگەیەکی واقعیانەو بەرجەستەبووندا بۆی دەڕوانرێت.. وە بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو ئەو بەڕێوەبردنەیە کە چەندەها ئامانجی پیرۆزو ڕێزدار دەپێکێت کە دەبێتە مایەی سود و کەڵك بە خەڵك گەیاندن و دەستەبەر کردنی داوا ڕەواکانو جێبەجێ کردنی داوا کراوەکان بەگوێرەی ڕازی بوونی خواو لەسەر ڕێبازی بەرنامەو ڕێگە پیرۆزەکەی. بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو لەسەر نەخشە وەستاوە کە بریتیە لە دیاری کردنی کەسانی گونجاو بۆ ڕاپەڕاندنی نەخشەکە و دانانی بەرنامەو نەخشە بۆ پیادەکردنیانو خۆ ئەگەر ئەم دیاری کردنە نەبێت ئەوا دەبێتە هۆی واز لێهێنانی چەندەها کارو بەرنامەی گرنگ و پاشان دیاری نەکردنی لێپرسراوێك بۆ هەستان بە جێبەجێکردنی کارەکان.

وە کاتێکیش کە تەماشای ژیانی موسڵمانانی پێشوو دەکەین دەبینین کە بیرۆکەی بەرنامەدانان لە کارەکانیاندا ڕەنگی دابۆوە وە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەرجەستەیان کردبوو، ئائەوەش پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە خوای گەورە سروشی (وحی) بۆ ناردبوو کە بۆ (مەدینە) کۆچ بکات، لەبەرئەوە دەستی کرد بە بەرنامەڕێژی و نەخشەکێشان لەسەر گرنگی

هەڵبژاردنی مەدینە بۆ کۆچ کردن کە شوێنێکی گرنگە و دەگونجێت لەگەڵ مەبەستەکەیاندا.

جگە لەوەی کە خزمو خاڵەکانی باپیرەی (عبدالمطلب) لێ نیشتەجێ بوون، کە نیمچە دورگەی عەرەب دەوڵەمەند بوو بەئاوو کشتوکاڵو شوێنێکی گونجاو بوو بۆ بازرگانی لە (مەککە) وە بۆ وڵاتی (شام) وە هەروەها لەبەرئەوەی کە دەوروبەری ئەو شوێنە بەخاوەن کتێبە ئاسمانییەکان[٢٤] گیرابوون، هەڵبەتە وەڵام دانەوەی ئەوان بۆ ئاینەکەی زیاتر دەبێت وەك لە شوێنەکانی تری.

* * *

## ٢- پەیڕەوکردنی بنەمای ڕێکخستن:

ڕێکخستن: لەزاراوە و تێگەیشتنە زانستییەکەیدا بریتییە لە ڕێکخستنو دیاریکردنی ئەرکەکان و پسپۆریەکانبۆ ئەو کەسانەی کە کارەکان ڕادەپەڕێنن، وە هەروەها دیاری کردنی ئەو کاتانەی کە کارەکانیان تێداجێبەجێ دەکرێت،وئەو کاتەی کە دەبێتەهۆی بەئاکام گەیشتنی هەموو ئامانجەکان کە لەوەوپێش دیاریمان کرد.. وە ئەوەی کە دەچێتە ناو چوارچێوەی ڕێکخستنەوە چەند خاڵێکی ترن:-

*کێشانی بوون و قەبارەی کارەکان.

*دیاری کردنی بەرپرسیارییەتیەکان.

*دیاری کردنی پەیوەندییەکان.

*هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرو بەرپرسیاران لە کارەکاندا.

---

[٢٤] واتە: جولەکە (جو) و گاورەکان (نصرانیە)کان دەورە درابوون.

بێگومان کرداری ڕێکخستن لەدوای نەخشەیەکی چاك و پتەو و تەواو دێت ئەو کاتەش بەڕێوەبەری چاك و سەرکەوتووی پێ بنیات دەنرێت، کە دەبێتــــەهۆی دیـــاری کردنـــی هـــەڵبژاردن و جیاکردنـــەوەی تایبەتمەندی‌یەکان، وە هەروەها دانانی کەسە چـاك و پاڵێوراوەکـان بـۆ شوێنی گونجاوی خۆیان هەتا ڕاپەڕاندنی کارو ئەنجامەکانیان بەباشی بچێـت بـەڕێوە. وە بـەهۆی ڕێکخسـتنەوە لەسـەر ڕێرەوێکـی ڕاسـت و دروست گرنگی دەدرێت بەکات و دەبێتە پاڵ پشت بۆ ئەنجام گەیاندنی ئامانجە دیاری کراوەکان.

وە ئـەو شـێوەیەی کەبنیان‌نـراوەونەخشـەی بـۆ کێشـراوە دەبێـت کاروبارەکان لەو بازنەیەدا بخولێتەوە و ڕاپەڕێنرێت.. پێویستە لەسەر کرێکارەکان کاتێك ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ هـەر گـیروگرفتێکدا، ئـەوا پێویسـتە بیگێڕنـەوە بـۆ کـارگێر (بەڕێوەبـەر) هـەتا لـەوێ چارەسـەری گرفتەکانیان بکرێت و ئەوانیش بتوانن سەربەستانە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربـــبڕن. بێگومــــان دەبێـــت کـــارگێڕیش بـــەدەم بۆچـــوون و گیروگرفتەکانیانەوە بچێت و چارەیان بۆ بدۆزێتەوە.

وە هــەروەها دەبێــت پێداویســتی تــەواو بخاتــە بەردەســتیان بــۆ ڕاپـەڕاندنی کارەکانیــان وە چاودێریــان بکـات کـە کاتــەکانیان بــەفیڕۆ نــەدەن.. وە پــەیوەندی نێــوان کرێکارەکــان و بەرپرســەکان دەبێــت پەیوەندییـەکی زۆر پتـەوو لەسـەر بناغـەی خۆشەویستی‌یەکی بـەهێزو ڕاست بنیات نرابێت و گیانی هاوکاری و تەبایی و باوەڕ بەیەکتری کردن و تێگەیشتن لەیەکتری لەنێوانیاندا بەرفراوان بێت..

وە پاشـان دەبێـت کارەکـان لـەنێوان کرێکارەکـاندا دابـەش بکـرێ‌و هەرکەسـە ئـەرکی سەرشـانی خـۆی بزانێـت، کـە ئەمـە چاکـترین و

بەسـودترین ڕێگایـە بـۆ بەهرەمـەندبوون لـە تێكۆشـان و ووزەو توانـای كرێكارەكان، هـەروەكو (عومـەری كوڕی خـەتاب) (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەفـەرموێت: هەركەسێك دەیـەوێت لـەبارەی (فقـه)وە پرسـیارم لێ بكـات ئەوە با (ئوبەی كوری كعب)م بۆ بێنێ، وە هەر كەس لەبارەی (ماڵ) وە پارەو سامانەوە پرسیار دەكات، ئەوە بابێت بۆ لای خۆم چونكە خوای گەورە منی كردووە بە خازن و دابەشكاری ماڵو سامانەكان، كەواتـە دابـەش كردنـی كارەكـان زۆر كارمـان بـۆ ئاسـان و مسـۆگەر دەكـات. وە دەبێتـە هـۆی پـێ بەخشـینی توانـاو لێـهاتوویی كەسـانی تریـش بـۆ بەشداری كردن لـەم ئەركە گرنگ و پڕ لـەخێرو بەرەكەتانـەدا، وە پاشان پاڵنەرێكیشـە بـۆ پێشـبڕكێ كـردن لـە كارەكـاندا، وە ئەمـەش دیسـان ئەوەمان تـێ دەگەیـەنێ كـە كەسـی گونجـاو لەجێگـەی شـیاوی خۆیـدا دابنرێت هەتا بەرهەم زیاتر بێت و پشێوی لە بەڕێوەبردن و ڕێكخستندا دروست نەبێت...

*  *  *

خەلیفە عەلی كوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت:

> من نصب نفسه اماماً فليبدء بتعليم نفسه قبل تعليم غيره
> وليكن تهذيبه بسيرته قبل تهذيبه بالسانه، ومعلم نفسه
> ومهذبها احق بالاجلال من معلم الناس ومهذبهم

## چاكی و ڕێك وپێكی بەڕێوەبردن:

چاكی بەڕێوەبردن بەواتا زانستی یەكەی ئەم فەرمانانە دەگرێتەخۆی:

١)دەركرنـی نەخشـەو پیـادەكردنی ڕاێكخسـتن لـە ئیش وكارەكـاندا و ڕاپەڕاند ، نیان لە گرنگترین لایەنی زانسـتی و كـرداری بەڕێوەبردنـە، بـەبێ جێبەجێ كردنی نەخشەو ڕێكخسـتن هیـچ پێشـەكەوتنێك لـەكارەكاندا بەخۆیەوە نابینێت.

٢)دیاری كردنی تواناكان و خستەگەریان لـەكاردا پاشـان دیـاری كردنـی ئیشـە گرنگەكانیان لەو كارەدا بەپێی ئەو پیلان و یاسایەی بـۆی كێشـراوە لەوەوپێش جا ئەو توانایانە مرۆیی بێت یان غەیری مرۆیی.

٣)دڵنیـابوون و دابـین كردنـی پێداویسـتی یەكان لـەم قۆناغـەدا بەشێوەیەك كە شتەكان جێگیرو ئامادەبن هەتا بتوانرێت لەژێر تیشكی ئەمەدا پێوانەیەكی جێگیر بۆ ئیش و كارەكان دابنرێت لەكاتێكی دیاری كراودا، خۆ ئەگـەر وامـان نـەكرد ئـەوا پرۆژەكـان لەوانەیـە دوابكـەوێت وەیان سەركەوتوو نەبن.

٤)هاوكاری كردن و ڕیزبەندی لەگەڵ كرێكارەكاندا و كۆشش كـردن لەگـەڵیاندا لـەكاركردندا، لەگـەڵ دیـاری كردنـی هـەموو یـەكێك لـە بەشداربوان و هەڵسەنگاندنی كاروباری هەر یەكێكیان و زانینـی هـەموو ئەو كۆشش و توانایەی كە پێشكەش دەكرێن.

٥)كێشانی كارەكان و نرخاندنیان لەهەموو قۆناغەكانی بەڕێوەبردندا و سود وەرگرتن لەو شوناسەی كە دەمان گەیەنێت بەچاكترین پێوانە لە جێبەجێ كردنی كات و شوێنی دیاری كراو و ئامادەكردنیدا، هـەروەها دیاریكردن و شوناسكردنی بەشداربوان لە كارەكەدا.

٦)چاوەدێری كارەكان بەشێوەیەكی زۆر باش لەبەر ئەم ئامانجانە:-

١-جوان كردنى كارەكان بەگوێرەى توانا.

٢-ئاگادارىو پارێزگارى كردن لەوەى كە لە ئامانج و مەبەست دەرنەچێت و لانەدات.

٣-وپارێزگارى كردن لەسەر بەردەوام بوونى.

٤-وپارێزگارى كردن لەسەر توندوتۆڵى و ڕاگرتن.

بێگومان ڕاپەڕاندنى ڕێكو پێك بەشێكە لە جوانى و ڕێكو پێكى بەڕێوەبردن. ئەگەر بێتوو بەو شێوەیە بەڕێوە نەچێت كە باسمان كرد ئەوە لە چۆنیەتى و چەندێتى كارەكانمان كەم دەبێتەوە هیچ كاتێك ئامانجەكانمان بەچاكى ناپێكین. لەبەرئەوە زۆر پێویستە كە لەسەر نەخشەدانان و ڕێكخستن بچێت بەڕێوە، نموونەى وردیش بۆ ئەم جۆرە كارانە ئەوەیە كە جارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) حوزیفەى یەمانى دەنێرێت بۆ ناو )(الاحزاب)[٣٥] كە هەتا هەواڵ و باسیان بزانێت:

پێغەمبەرى خوا بە حەزیفەى فەرموو: (أذهب فادخل في القوم فانظر ماذا يضعون لايتحدثن شيئاً حتى تاتينا..)[٣٦]

واتە: بچۆرە ناو ئەو گەلەوە تەماشا بكە بزانە چى دەكەن و هیچ شتێك ناكەیت هەتا دێیتەوە بۆ لامان و هەواڵەكەمان پێ دەگەیەنیت، (حوذیفە) دەڵێ: ئەگەر پەیمانەكەى پێغەمبەر (ﷺ)نەبوایە كە هیچ شتێك نەكەم دەمتوانى بەتیرێك سەركردەكەیان بكوژم.

وە دیارى كردنى وزەو تواناكانیش بەشێكە لەجوانى (ئیدارە) بەڕێوەبردن؛ چونكە ئەو دابەشكردنى وزەو توانایانەو بەرپرسیارێتى ڕپەڕاندیان بەردى

---

[٣٥] بریتى بوون لەو هۆزانەى كە یەكیان گرت بۆ بەرەنگاربوونەوەى پێغەمبەر (ﷺ)

[٣٦] تهذیب سیرة ابن هشام. لاپەڕە ٢٣٤-٢٣٥

بناغەی سەرکەوتنی کارەکەیە بەبێ داڕشتنی ئەو نەخشەو بەرنامەیە شتی نامۆو ناشایستە خۆی فڕێ دەداتە ناو کارەکانمانەوە.

زانین و ئاگاداربوونی ئەوانەی کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کارەکان لەگەڵ بەدواچوونەوەو چاودێری کردنیان و لێپرسینەوەو سەرپەرشتیکردنیان مایەی سەرکەوتنی کارەکەیە.. وەزانین و دڵنیابون لەسەلامەتی کرێکارەکان و کارکردنیان لەسەر ڕێڕەوێکی ڕاست.. وە بەزانینی گیروگرفتەکان و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گرفتەکان و زاڵ بوون بەسەر کۆسپەکاندا ئەبێتە مایەی سەرخستن و پێشکەوتنی کارەکانمان و پاشان بەدەست هێنانی بەرهەمی چاک و بایەخدار..

*  *  *

## کلیلی سەرفرازی

خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت:

> کێ پێی خۆشە بە بێ ماڵ و سامان دەوڵەمەنەد بێت،
> وە بەبێ دەسەڵات سەربەرز بێت، وە بەبێ کەس و کار زۆر بێت،
> با لە زەلیلی لە خوایاخیبوونەوە بچێتە نێو سەرفرازی
> گوێڕایەڵی خواوە، ئەو شتانەی هەموو وە دەست دەکەوێت.

## بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو ستایش کردنی هاوەڵەکانی:

ڕۆژانە بە بەرچاوی خۆمانەوە دەبینین کە بەڕێوەبەری سەرکەوتوو لە کاروبارەکانیدا خاوەنی پلەو پایەو بەخششێکی زۆر دەبێت، ئەگەرچی زۆرجار زیادەڕەوی و تێپەڕاندن و دەرچوون لە سنورێکدا دەبینرێت.

زۆرجاری تریش بەپێچەوانەوە دەبیستین کە ئەو پرۆژەیە بە شێوەیەکی سەرکەوتوو پیشان ئەدەن بەلێشاو پروپاگەندەی بۆ بلاودەکەنەوە و خەڵکی پێ دەخەڵەتێنن و لەڕاستیشدا هەرگیز بەو شێوەیە نییە کە خەڵکی لێی تێ دەگەیەنن، دیارە ئەوانە گوێیان لەخواروخێچی کارەکانیان نییەو گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندی کارەکەیان بپارێزن و بەردەوام بن لەسەری و کەموکوڕی و ناپاکی (خیانەت) لە ئیشەکەیاندا گرنگ نییە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەلاونەهامەتی و مشەخۆری بەسەر کۆمەڵگاوە وەهەموو باجەکەیشی تەنها نەدارو هەژارەکان دەیدەن. بەڵام ئیسلام ڕێو شوێنێکی مام ناوەندی گرتۆتەبەر لەم مەیدانەدا، نە زۆر بەشان و باڵدا هەڵ دەدات وەنە بەبێ سوپاس و ستایش بەجێی دەهێڵێت، بەڵکو سوپاسی ئەوانە دەکرێت کە خێرو چاکەیان بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەیە وە سەرزەنشتی ئەوانەش دەکرێت کە ناپاکی بە گەل و نەتەوەکەیان دەکەن و فێڵ و گزیکاری بەرپا دەکەن.

خوای گەورە باسی هەندێك لە خەڵکانی کردووە بە سیفاتی بەرزو جوان، هەروەکو چۆن دەربارەی زاناکان دەفەرموێت: (هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ)(الزمر: من الآية٩).

واتە: ئایا ئەوانەی کە زانان وەکو ئەوانە وان کە نەزانن ؟ وە دەربارەی ئەمین دارەداکان دەفەرموێ:

(وَالَّذِيـنَ هُـمْ لِأَمَانَاتِـهِمْ وَعَـهْدِهِمْ رَاعُـونَ) (المؤمنون:٨). واتـه: ئەوانـەی کـه چاودێری ئەمانەت و پەیمانەکانیان دەکەن‌و خیانەت و فێڵ ناکەن.

وه دەربـارەی ئەوانـەی کـه لـه بەرامبــەر وتنــی حــەقدا بـەهێزو پتــەون دەفەرموێ (فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُـلِ)(الاحقـاف: مـن الآيـة٣٥) ئارام بگره و خۆڕاگر به هەروەکو پێغەمبەره خۆڕاگرەکانی پێش خۆت کە بە (أولوالعزم) ناسراو بوون.

وه لـەبارەی بەخشندەکارانەوە (الكرمـاء) فەرمویەتی:( الَّذِيـنَ يُنْفِقُــونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لا يُتْبِعُونَ مَا أَنْفَقُوا مَنّاً وَلا أَذىً لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ)(البقرة:٢٦٢) واته: وه ئەوانەی کە ماڵ‌و سامانی خۆیان ئەبەخشن لە پێنـاوی خـوادا بـەبێ ئـەوەی ئەشکەنجەو منـەتی خەڵکی بەدوادا بێت، ئەوانە پاداشتیان لەلای خوای خۆیانەو نە خەفەت ئەخۆن وه نەترسیان لەسەره لەڕۆژی دواییدا..

وه دەربــارەی خــاوەنی (جیــهاد) و تێکۆشـــان لـــەپێناوی خـــوادا ئەفەرموێ: (لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِـي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِـهِمْ وَأَنْفُسِـهِمْ فَضَّـلَ اللَّـهُ الْمُجَـاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَـى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلّاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً) (النساء:٩٥).

واته:ئەوانەی دەرنەچوون بۆ جەنگ (ماونەتەوه لەماڵەوه) لە باوەڕداران ئەوانە نەبێت کە نـاتوانن و ناتـەواون وەك یـەك نین لەگـەڵ ئەوانـەی کـه دەردەچـن بـۆ جیـهادکردن لـەپێناوی خـوادا بـەماڵ‌و سـامان و گیانیـان بێگومـان خـوا ڕێــزو گــەورەیی و پلەیــەکی تایبــەتی بڕیــارداوه بــۆ تێکۆشەران بە ماڵیان بەگیانیان بەسەر ئەوانـەی کـه دانیشتوون، خوای

گەورە بەڵێنی چاکی پێداون و خوا فەزڵ و ڕێزی گەورەو بێ سنوری بۆ تێکۆشەرانی داناوە بەسەر دانیشتووەکاندا.

(وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ) (المؤمنون: ٤) واتە: وە ئەوانەی زەکاتی ماڵەکانیان ئەدەن و پاکی ئەکەنەوە لە ژەنگ و ژاری ڕەزیلی و بەخیلی و ڕژدی.

وە پێغەمبەری خواش ﷺ بەردەوام لەسەر ڕێبازی مام ناوەندی و میانڕەویی کاری کردووە، بۆیە دەبینین باسی کاربەدەستی ئەمین و دەست و دڵ پاکی کردووە و فەرموویەتی: **(الخازن الأمين الذي يؤدي ماأمر به طيبة نفسه احد المتصدقين)**[٣٧]

واتە: (ئەو کەسەی کە دەکرێت بە ئەمینداری خەزنەیەك دەست پاك و ئەمین بێت و نەفس و دەروونی پاك بێت وەکو فەرمانی پێکراوە ئەوە بە یەکێك لەڕاستگۆکان دەژمێردرێت).

وە لەبارەی هێزو (قوی)ەوە دەفەرموێ: **(المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير)**[٣٨]

واتە: بڕواداری بەهێز لەلای خوا خۆشەویسترە و چاکترە لە موسڵمانی بێهێز لەهەموو خێرێکدا.

وەباسی ئیمامی عومەری کوڕی خەتابی (ڕەزای خوای لێبێت) کردووە بەوەی کە بەهەر شوێنێکدا بڕوات شەیتان ڕێگاکەی دەگۆڕێت و بەڕێگایەکی تردا دەڕوات وەکو ئەفەرموێ **(ما لقيك الشيطان سالكاً فجاً الإسلك فجاً غير فجك)**[٣٩]

---

[٣٧] صحيح الجمع ٢٣٣٦.

[٣٨] متفق عليه و لە صحيحی جامعدا لە ژمارە ٢٦٦٧ هاتووە.

[٣٩] صحيح الجامع ٢٦٦٧، متفق عليه عن سعد.

لەهەمان کاتیشدا زیادە ڕۆیی و لە مەدح و وەسفدا قەدەغەکردووە کە لە سنووری خۆی دەربچێت، کە ببێ بەمایەی لووت بەرزی خاوەنەکەی بەو وەسفەی کە دەکرێت، هەروەکو ابوبکر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لەلای پێغەمبەر ﷺ زۆر وەسفی پیاوێکی تری کرد ئەویش فەرمووی: (ویلك قطعت عنق صاحبك) واتە: هاوار بۆ تۆ گەردنی براکەت یان هاوەڵەکەت بڕی و قرتاندت، وەیان دەفەرموێت ﷺ : (من كان منكم مادحاً أخاه لامحالة فليقل أجسب فلاناً والله حسيبه ولاأزكي على الله أحد أحسبه كذا وكذا إن كان يعلم ذالك منه)[٤٠]

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە ناچار بوو مەدحی براکەی بکات با بڵێت ئەو کەسەم بەو شێوەیە ناسیوەو حسابم بۆ کردووە، خوایە تۆش بەو شێوەیە حسابی بۆ بکە، کەس لای خوا ئەستۆپاکی کەسی تری بۆ ناکرێت، خوایە بەم شێوەو بەم جۆرە حسابی بۆ بکە بێگومان خۆت زۆر زاناتری لەسەری.

ئەبی موسی الاشعری/ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو باسی پیاوێکی تری کردو زیادە ڕۆیی تیادا کرد.

ئەویش فەرموی (لقد أهلكتم أو قطعتم الرجل)، واتە بەهیلاکت بردو لە ناوت برد، لەبەرئەوە زیادە ڕۆیی لەمەدح و وەسفدا کرد، بێگومان مەدح و وەسفێك کە لە سنوری خۆی دەربچێ ئیسلام قەدەغەو یاساغی کردووە، لەبەرئەوە ئەبێتە هۆی یاخی بوون و مەغرور بوونی ئەو کەسەی کە زۆر بەشان و باڵیدا هەڵ دەدەیت.

---

[٤٠] رواه أحمد والبخاري ومسلم وابو داود وابن ماجة عن ابي بكر، وفي صحيح الجامع الالباني ٧١٤٠.

(ئیمامی نووی) دەفەرمویت: بەتایبەتی نەهی کراوە لەو مەدحانەی کە بزانی دەبێتە هۆی سەرکەش بوونی خاوەنەکەی، وەیان توشی لەخۆ بایی بوون و خەڵەتاندن بێت و سەیرو سەرسوڕمانی بە نەفسی خۆیدا بێت، و لەخۆی بایی بێت کاتێ ئەو مەدحانە ببیستێ.

وە هەروەها ئەگەر ئەو مەدح و وەسفە بەرژەوەندییەکی خێری تێدابوو، وەکو ئەوەی کە زیاتر ئەو کەسە هان بدات و بێتە مایەی خێرو چاکەی زیاتر بۆی، و سوربوون و بەردەوامی زۆرتری پێ ببەخشێت ئەوە هیچ لارییەکی تێدانییەو زەرەرمەند نابێت بەڵکو باشیشە (مستحبە) و سووننەتە، بۆئەوەی بەردەوامیەتی بەو کەسە ببەخشێو پاشان کەسانی تریش چاوی لێبکەن و شوێن پێی هەڵبگرن.

* * *

المؤمن القوي خير وأحب الى الله
من المؤمن الضعيف وفي كل خير

## سێیەم:

## چۆن لێپرسراوی شارەزا و بەتوانا هەڵدەبژێریت:-

بەڕێوەبردنی سەردەم و تازەی شارستانێتی ئێستا پشت دەبەستێ بە دانانی کەسانی شایستە لە جێگەی شایستەی خۆیدا، وەیان لەچەند ڕێگەیەکی ترەوە کاری بۆ ئاسان دەکرێت و بەهۆی ڕێزی کەسانی ترەوە وەردەگیرێت، ئەمانە بەبێ ئەوەی زانیاری تەواویان لەبارەی ڕابردووی پێشووی ئەو کەسەوە هەبێت و سەیری مێژووی ژیانی بکرێ، وەیان بەبێ ئەوەی متمانەو پشتیوان ی کەسانی تری لەسەر وەربگیرێت.

بەڵام بەڕێوەبردن لە ئیسلامدا خاوەنی پێوانە تایبەتیەکانە لە پا لاوتنی لێپرسراوان و هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرەکان لەوانە: دەبێ خاوەن ڕابردوویەکی پاك بێت و چەندەها مەرجی چاکەی تری تێدابێت. وەباسی ئەو سیفەتە گشتیيانە دەکرێت بۆ هەر کەسێك کە شایستەی ئەو پۆستە بێت، تەنانەت بۆ پێش نوێژی کردنیش چەند سیفەت و دیاردەیەك باس دەکرێن وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (يؤم القوم أمرؤهم للكتاب الله فإن كانوا في القراءة سواء فأعلمهم بالسنة فإن كانو في السنة سواء فاقدمهم هجرة فإن كانوا في الهجرة سواء فاقدمهم سناً، ولا يؤمن الرجل الرجل في سلطانه ولايقعد على تكرمته الا باءذنه)[٤١]

بایەکێك ئیمامەتی و پێش نوێژیتان بکات کە شارەزابێت لە کیتابی (قورئانی) خوادا، ئەگەر لەوەدا یەکسان بوون، ئەوە کێ بە سوننەت و حدیث شارەزاترە با ئەوەتان ئیمامەتی بکات، خۆ ئەگەر لەوەشدا

---

[٤١] رواه أحمد ومسلم والتمزي وأبو داود والنسائي وابن ماجة ابن مسعود، وهو في صحيح الجامع رقم (٨٠١١).

یەکسان بوون ئەوەکێ لەپێشتردا هیجرەت و کۆچی کردووە با ئەوەتان بیکات، ئەگەر لەوەشدا یەکسان بوون کێ لە تەمەندا گەورەترە با ئەوەتان بیکات و پێش نوێژی کەسێك وەرناگیرێت لەماڵی کەسێکی تردابێت مەگەر لەسەر ئزنی خاوەن ماڵەکە بچێتە پێشەوە.

وە هەروەها لەم کارەدا ئامۆژگاری زانایان و حەکیمان وەردەگیرێت لە هەڵ بژاردن و پالاوتنی کەسەکاندا بۆ پۆستی لێپرسراویەتی کەشایستەی ئەو جێگەیە بێت.

هەروەکو لە حزیفەی کوڕی یەمان) دەگێڕنەوە کەلەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین و فەرمووی (لاأدری ماقدر بقائي فيكم فاقتدوا بالذين من بعدي أبي بكر و عمر واهتدوا بهدي عمار و ما حدثكم ابن مسعود فصد قوه)[٤٢]

واتە من ئەندازەی مانەوەی خۆم نازانم لە ناوتاندا، لەدوای من پشت بە ئەبوبکر و عومەر ببەستن و شوێن ڕێنمونی عمار بکەون و، ابن مسعود چی بۆتان گێڕایەوە بەڕاستی بزانن.

هەروەها پێغەمبەری خوا لەکاتی نزیك بوونەوەی مردنیدا ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێت) هەڵدەبژێرێت بۆ ئیمامەتی کردن، کە لە هەمان کاتدا زۆر نزیك تریش لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەبوو، بەلاَم ئەو ﷺ هیچ پێوانەیەکی بۆ نزیکی و خزمایەتی نەدەکرد.

وە هەروەها (عەمری کوڕی عاص) دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەوەی کە کێ خۆشەویست ترە لەلات لەهەموو کەسێکی تر؟ فەرمووی ﷺ: عائیشە، پێم ووت ئەی لەپیاواندا

---

[٤٢] رواه في مسنده والترمزي وابن ماجة جبان عن حذيفة وهو في صحيح الجامع رقم ٢٥١١.

کێت زۆر خۆش دەویٚ فـەرمووی ﷺ: عومـەر.[٤٢] واتـە: عومـەری کـوڕی خەتاب – خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر ﷺ.

وە هـەروەها لەسـەر بنەمای وەرگرتنـی پسـپۆرییەکان دەبێـت پیـاوی گونجاو لەجێگەی گونجاودا دابنرێت، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ پۆلێنـی زۆربەی هـاوەڵانی کـردووە و هەریەکـەی پایـەو تایبـەتی خـۆی پیٚبەخشیووە، وەکو دەفەرموێت:

(أرحم أمتي بامتي أبوبكر وأشدهم في امر الله عمـر وأشـدهم حيـاء عثمـان وأقضاهم علي، واعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل وافرضهم زيد بـن ثـابت و أقرؤهم ابى بن كعب ولكل قوم أمين و أمين هذه الأمة أبو عبيدة بـن الجـراح وما اظلت الخضراء ولا أقلت الغبراء اصدق لهجة من ابـي ذر أشـبه عيسـى عليـه السلام في ورعه قال عمر أفنعرف ذلك له يا رسول الله ؟ قال نعم فاعرفوا له).

بـەڵیٚ لـە ئیسـلامدا ئـا بـەو شێوەیە مرۆڤـەکان پۆلێـن دەکرێـن، وەکـو پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: خوایـە لەنەتەوەکـەم خۆشـبێت بـە بـەزەیی (ئەبوبـەرکی صدیق) وە ئـەوەی کـە زۆر لەسـەر فەرمانـەکانی خـوا تونـدو تیـژە (عومـەری کوڕی خەتابـە) بەحـەیاترین و بەشـەرم ترینتـان (عثمـان کـوڕی عفانـە) وە داد پـەروەرترینتان لـە دادوەریـدا(لـە قـەزاوەتدا) علـی کوڕی ابو طالبە زاناترینتـان بەحـەرامو حـەڵاڵ کراوەکانی خـوا (معـاذی کوڕی جەبەل)ە لە ئەرکەکانی بەندایەتی (زەیدی کوڕی ثابتـە) وە چاکترین کەستان لە قورئاندا خوێندندا (ئوبەی کـوڕی کەعبە) وە بۆ هـەموو گـەل و نەتـەوەیـەك ئـەمین و دەست پـاکێك هەیە، وە ئـەمین و دەست پـاك و جـیٚ ی

---

[٤٢] متفق عليه، رواه الترمذي عن عمر وبن العاص و عن انفس وابن ماجة عن انس. وهو صحيح الجامع رقم ١٧٧.

متمانەی گەلەکەی من (ابو عبیدەی کوڕی جەراحە) وە(ئەبی ذەریش) زوبان پاراو و ڕەوان بێژبوو بەشێوەی یەك کەس شانی نەداوە لەشانی لەوەرعیشدا هەروەکو حەزرەتی عیسا (علیه السلام) بووە، بۆیە عومەر فەرمووی: ئایا هەر بەو سیفەتە وە بیناسینەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: فەرموی بەڵێ هەر بەوسیفاتانەوە بیاننناسنەوە.

وە هەروەها دەبێت کە شایەتی خەڵکی پەسند بکرێت کە ئیمان دارەو شایەنی ئەو شوێن و جێگایەیە،وچوونە مزگەوتی بە بەردەوامی دەبێتە شایەت و بەڵگەی ئاشکرا بۆئەو کەسە و ناسنامەی ڕاستێتی پێ وەردەگرێت.

وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت (إذا رأيتم الرجل يرتادوالمساجد فاشهدوا له بالأيمان) واتە: ئەگەر بینیتان یەکێك بە بەردەوامی هاتوچۆی مزگەوت دەکات و خوی پێوەگرتووە، ئەوە شایەتی ئیمانی بۆ بدەن.

وە هەروەها ناوشۆرەت و سومعەی چاکی ئەو کەسە و جیهادکردنی لەپێناوی خواداو ڕەفتارە چاکەکانیپێشووی لەکرداریو ڕەفتاری چاکیدا دەبێتە بەڵگە بۆ وەرگرتنی لەپۆستی لێپرسراوێتیدا.

بەڵێ، ئەگەر ئێمە بەم پێوەرانە هەوڵمان دا کە ئەو کەسانەی دەخرێنە ناو ئەو پۆست و وەزارەتانەوە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزو جوانانە بن ئەوە هەرگیز زەرەر ناکەین و ئەوانیش سوود و قازانجی پڕ بەپێستی خۆیان بە کۆمەڵگاو جەماوەر ئەگەیەنن و دەبنەهۆی بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری و ئاوەدانی و ئاکارو ڕەفتاری جوان، و دەبنە نمونەی بێ وێنەی پەروەردەکراوی دەستی ئەم ئیسلامە ناوازەو بێگەردە کە هەزاران پیاوی شیاوی گونجاوی وای بۆ ئەو پۆست و جێگایانە هەڵبژاردووە و پێی گەیاندووە.

بۆیە خەڵکی لەژێر سێبەری دادو یەکسانیاندا حەسانەوە و بوژانەوە و لەدەست زوڵم و زۆرو جەوری ستەمکاران ڕزگاریان بوو. و چێژی ئیمان و خواپەرستی و عەدالەت و یەکسانیان چەشت، بۆیە تەنها لە ئیسلامدا پیاوانی وا دەتوانن خزمەت بەخۆیان و کۆمەڵگاکەیان بگەیەنن و دەستی نزمی خواروخێچی بەرتیل خۆران بۆکەس پان نەکەنەوە و گیرمانی دونیا ویستی پڕ نەکەن و ئەو هەموو دیاردە دزێوانەی کە ئەمڕۆ هەن بنەبڕی بکەن. هەر بۆیە پێویستە لەسەر ڕابونی ئیسلامی ئێستامان هەر بە هەمان پێودانگ و پێوەرو پەیکەر ڕێکخستنی مادی و سەربازی و هتد.. دابمەزرێنن و بەبەرچاو ڕۆشنی و بەدوربینی یەکی وردبینانەوە کەسانی گونجاو لەشوێنی گونجاوی خۆیان دابنێن

هەتاکو ببنە خاوەنی سوود و قازانج بۆ ئیسلام و موسڵمانان و بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە ئیسلام خاوەنی بەرنامەیەکی ئەوەندە ناوازو بێوێنەیە،وخاوەنی ئەزمونێکی پاکو پوختەی نەپساوەیە،وخاوەنی مێژوویەکی پرشنگدار و پڕ لەداد و یەکسانی و هاوکاری و تەبایی و خۆشەویستی یە، و تا بیسەلمێنن کە کەسانی دەغەڵو خراپەکارو دونیا ویست و خۆ ساغ نەکەرەوە بۆ خوا جێگایان نابێتەوە و موسڵمانان لەشەڕو نیازیان خۆدەپارێزن.

## بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو... زیرەکی :-

بێگومان هەموو کەسێك هەوڵ دەدات بۆ کارەکانی (بچوك بێت یان گەورە) کەسانێك هەڵبژێرێت کە لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە شارەزاو زیرەك بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت کە سودو قازانجی تەواو بە کارەکانی بگەیەنێتو لە لایەنە خراپییەکانی بە دوور بێت.

وە ئیسلامیش زۆر بە چاکیو بە بێ کەمتەرخەمی گرنگی بەم لایەنی هەڵبژاردنی کەسانی زیرەكو شایستە داوە لە کارەکاندا، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ دەکاتو دەفەرموێت (المؤمن كيس فطن)

واتە: باوەڕدار زیرەكو ورد بینە ، موسوڵمانی هۆشیار بە دوای زیرەکیو هۆشمەندیو سیاسەتی سەرکەوتوودا دەگەڕێت، بۆ ئەوەی کاروبارەکانی بە چاکی بەڕێوەبچێت، وە هەروەها هەموو تواناکانی دەخاتە گەڕ بۆ بەدی هێنانی هیواو ئامانجەکانی لە پێناو بەرژەوەندی خەڵکیدا، و کە بەردەوام بەرنامەو پڕۆژەی ئەوەیە کە لە خزمەتی بەندەکانی خودا بێت.

وە باوەڕداران تەماشای بەرامبەرەکانیان ناکەن کە ئەو ڕە فتاری چۆن بێت ئەمیش هەمان ڕەفتاری هەبێت، بەڵکو ئەم کارانە قەدەغەکراوەو داوای دوورکەوتنەوەیان لێدەکات، وەکو پێشەوای مرۆڤایەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(لا يكن أحدكم إمعه يقول انا مع الناس إن احسن الناس أحسنت وإن أساءوا أساءت)[٤٥]

---

[٤٥] الترمذي- ضعيف/ ضعيفغ الجامع- ٦٢٧١- للألباني

نابێت موسوڵمان بڵێت من لەگەڵ خەڵکیدا ئەبم ئەگەر چاك بوون ئەوا منیش چاك ئەبم، وە ئەگەر خراپ بوون ئەوا منیش خراپ ئەبم.. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام قەدەغەی ئەو زیرەکی و لێهاتوویی یەیکردووە کە لە پێناوی نارەوادا بخرێتە کارو ببێتە هۆی هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی و چاو لێکردن و فێڵ و تەڵەکەبازی بەکارهێنان وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ) (البقرة:١١).

واتە/ کاتێك پێیان دەڵێیت خراپەکاری و پشێوی لەسەر زەویدا بڵاو مەکەنەوە کەچی لە وەڵامدا ئەڵێن: نەخێر ئێمە هەر چاکە خوازین و چاکسازی ئەکەین!.

وە هەروەها پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووە لەوەی کە باوەڕداران توخنی فێڵ و تەڵەکە بازییەکانی گاورو جولەکە بکەون، وەکو دەفەرموێت

**(لا ترتكبوا ما ارتكبت اليهود فستحلوا محارم الله بادنى الحيل).**

ئێوە وەکو جولەکەکان مەبن کە بە دوای بچوکترین فێڵدا دەگەڕان بۆ حەڵاڵکردنی حەرامەکانی خوای گەورە، بێگومان فێڵ و خەڵەتاندن جۆرێکە لە رەفتارە ناشایستەکانی شەیتان (ئیبلیس) کە موسوڵمان پێی ڕازی نییەو نایەوێت، وەکو (عومەری کوڕی خەتاب) دەفەرموێت (من فێڵکەرو فێڵباز نیم و فێڵبازیش ناتوانێ بمخەڵەتێنێت، فێڵ لە کەس ناکەم و لە هەمان کاتیشدا ناهێڵم فێڵباز فێڵم لێبکات)..

بەڵێ زیرەکی و لێهاتوویی لە بەڕێوەبردندا کەڵك و سوودێکی زۆر دەگەیەنێت بۆ بەرەو پێشبردنی کارو بارەکان و بە چاکی و دروستی بە ئەنجام گەیاندنیان، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر لێپرسراوەکان بە دوای

ئەم خاڵە زۆر گرنگەدا بگەڕێن‌و بە دڵسۆزی کاری بۆ بکەن بۆ ئەوەی زیاتر بتوانن زاڵ بن بەسەر کێشەو گیروگرفتەکانیانداو چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە، وە ئەو زیرەکی و لێهاتوویییەی کە ئێمە بانگەشەی بۆ دەکەین دەبێت ئەو کەسە خاوەنی رەوشت‌و ئاکاری جوان بێت‌و پاشان ئەو زیرەکییەشی تێدا ڕەنگ بداتەوە، بەڵام ئەو کەسانەی کە زیرەکی و لێهاتوویی‌یەکانیان لە شەڕو خراپەو خەڵەتاندن‌و فێڵ‌و گزیدا بەکار دەهێنن ئەوە ئەو خراپەکارییە روی ناشرینی خۆیان دەگرێتەوەو دەبێتە مایەی پشێوی‌و نائارامی بۆ خودی خۆیان، چونکە هەرکەسێك بیەوێت خەڵکی بخەڵەتێنێ، ئەوە لە راستدیا خۆی خەڵەتاندووە، خۆ ئەگەر جارێك‌و دوو جاریش سەرکەوتوو بێت لە فێڵ‌و گزی کارییەکانیاندا، ئەوە ناتوانێت بەردەوام بێت‌و ئاشکرا دەبێت،و لەناو خەڵکیدا سوك‌و ریسوا دەبێت، خوای گەورە ئەفەرموێت:

(وَلا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ)(فاطر: من الآية٤٣)

واتە: پیلان‌و شەڕو تاوان‌و فڕوفێڵ هەمیشە بە سەرئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن.

وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)– واتە/ بڕوادار دوو جار لە کونێکەوە ناگەزرێت..

شاعیری کوردیش بۆ جەختکردنەوە لەسەر فەرموودەکەی پێغەمبەر دەڵێت: بە کەسێك دەڵێن عاقڵ‌و هۆشیار کە دوو جار لە کونێك پێوەی نەدا مار.

## پێویستە یاریدەرە لێهاتووەکان هەڵبژێردرێن:-

بێگومان هیچ لێپرسراوێك نییە لەوپەڕی لێپرسراویو پلە بەرزیشدا بێت پێویستی بە یارمەتیدەرو جێگر (بریکار) نەبێت، بۆ ئەوەی لە کاروبارەکانیدا یارمەتی بداتو ئەو ناڕەحەتیو ئێشو ئازارە بچێژێت لەگەڵیداو دەستباری لەگەڵدا بکات، بۆ ئەوەی کە زوو لە کاروانی ڕێگادا هیلاكو ماندو نەبێتو بەردەوام لە هاوکاری کردنیدا بێت لە زۆربەی کارو بارەکانیدا، لەکاتێکدا کە ئەو توشی نەخۆشیو ناڕەحەتیو گیرو گرفتێك دەبێت، وە یان شتێکی لەبیر دەچێت، ئەوا جێگرەکەی جێگای دەگرێتەوەو ناهێڵێت لە کارو بارەکان رابوەستێتو بە جێبەجێنەکراوی بمێننەوە، لەبەر ئەوە ئیسلام زۆر گرنگی ئەدات بە هەڵبژاردنی کەسانی چاكو لێوەشاوە بۆ ئەو جێگایە وەکو خوای گەورە ئەفەرموێت:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ) (آل عمران:١١٨) واتە/ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بە کەسانی تر متمانە مەکەنو نهێنی خۆتان مەدرکێنن چونکە خەڵکانی تر کۆڵنادەن لە هێنانی گیروگرفتو تەنگانە بۆ تان، ئاواتیان ئازاردانو کێشەیە بۆتان بە ئاشکرا خەشمو رقو کینەیان لێدەبارێت ئەوەی لە سنگیاندا شاردۆتەوە زۆر گەورەترە لەوەی دەری دەبڕن، بێگومان بە نیشانەو بەڵگە بۆمان روونکردوونەوە ئەگەر ژیریتان بخەنە کار.

وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت (من ولاه الله أمر المسلمين شيئا فاراد به خيرا جعل له وزير صدق إن نسي ذكره وان ذكر أعانه).

هەرکەسێك کاروباری موسوڵمانانی گرتە دەست، ئەگەر خێری تێدا بێت ئەوە وەزیرو یارمەتیدەرێکی راستگۆو چاك دەکاتە جێگیرو

هاودەمی کە کاتێك شتی لە بیرچووەوە بیری دەخاتـەوە، وە وە کـاتێك باسکرا ئەوە پشتی دەگرێت هاوکاری دەکات.

خۆ ئەگـەر باسـی ژیـانی پێغەمبـەری خـوا بکـەین ئـەوە دەبینـین چاکترین و راسـتگۆترین کەسـی کـردووە بـە وەزیـرو هـاودەنگی خـۆی، هەروەکو (سعیدی کوڕی موسـەیب) دەڵێـت: (ئەبوبەرکری صدیق لەلای پێغەمبەری خـوا جێگـەی وەزیـری پـێ بەخشـرابوو، وە ڕاوێـژی ئـەکرد لەگەڵیدا لـە هـەموو کاروبارەکـاندا، وە دووەم کـەس بـوو لـە ئیسـلامدا، پاشـان هـاوەڵی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو لـە ئەشـکەوتەکەدا، وە لـە بـن ساباتی بەدردا دووەم کەس بوو، دووەم کەسێکیشە کە گۆڕەکەی لەگەڵ گۆڕی پێغەمبەری خوادایە وە پێغەمبەر کەسی پێش ئەبوبەکر (خـوای لـێ رازی بێت) نە دەخست.)

پاشان جیاکردنەوەی کەسانی چاك و خراپ بەوە دەبێت، کە ئەگەر ئەو کەسە فەرمانی بە چاکە کردو بەردەوامبوو لەسەری ئـەوە لە چاکە کارانە، خۆ ئەگەر فەرمانی دەکرد بە خراپـە ئـەوە بێگومـان لـە خراپـە کارانەو پێویستە لابرێ و ئەو پۆستەی لـی بسەندرێتەوە.

(أبـو سـعید الخـدری)- رەزای خـۆی لـێ بێ- لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ما بعث الله من نبي ولا استخلف من خليفـة إلا كانت له بطانتان: بطانة تأمره بالمعروف وتحضه عليه وبطانة تأمره باالشر وتحضه عليه فالمعصوم من عصمه الله).

هیچ پێغەمبەرێك نـەبووە لـە پێغەمبـەران کە خوای گـەورە نـاردبێتی و جێنشینێکی نەبووبێت، یەکێکیان بەردەوام فەرمانی بە چاکە کردووەو زۆر پێداگریشـی لەسـەر کـردووە، وە یـەکێکی تریـان فـەرمانی بـە خراپـە کردووەو پێداگریشی لەسەر کردووە، وە پارێزراو ئەو کەسەیە کە خوای گەورە بیپارێزێت.

(ابن تيميه) دەڵێ: پێویستە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان (ولى الامر) کە کەسانی چاك هەڵبژێرن بۆ ژێر دەستەکانیان کە زۆر چالاکانە کارەکانیان بۆ هەڵبسوڕێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من ولي من أمور المسلمين شيئاً فولى رجلاً وهو يجد أصلح للمسلمين منه فقد خان الله ورسوله) لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (من ولى رجلا على عصابة وهو يجد في تلك العصابة من هو أرضى لله منه فقد خان الله ورسوله وخان المؤمنين) واتە: ئەوەی کە پیاوێك دابنێت بۆ فەرمانڕەوایی (والى) مسوڵمانان لە سەر دەمارگیری هۆزەکەی لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵی خۆیەتی وە وابزانێت ئەم کەسە بۆ ڕەزامەندی خوا باشترە لە خەڵکانی تر، ئەوا بەمە خیانەتی کردووە لە خواو پێغەمبەرو مسوڵمانان، هەرکەسێك کاروباری موسوڵمانان بگرێتە دەست، دەبێت کەسانی چاكو هۆشیار هەڵبژێرێت بۆ موسوڵمانان، ئەگەر وا نەبوو ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان کردووە،ولە ڕۆژی دواییدا بەرپرسیار دەبێت.

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەفەرموێت (من ولى من أمر المسلمين شيئا فولى رجلا لمودة أو قرابة بينهما فقد خان الله ورسوله والمسلميين) واتە/ هەر کەسێك کاری موسوڵمانانی گرتە دەست بیەوێت کە کەسانی نزیكو خزمەکانی بکاتە کاربەدەستو فەرمانڕەوا (لەبەر خزمایەتی) ئەوە خیانەتی لە خواو لە پێغەمبەر ﷺولە موسوڵمانان کردووە. کەواتە لە ئیسلامدا نزیکیو خزمایەتی کاری پێ ناکرێت بەڵکو کرداری چاکەو خواپەرستی ڕاستەقینە کاری پێدەکرێت.

هەڵبەتە هەڵبژاردنی جێگری چاكو دەستپاكو زیرەكو خواناس چەندەها سودو قازانجو بەرهەمی دەبێت، بۆ نمونە وەکو:

١-هەست بە لێپرسراوێتی خۆی دەکاتو دەبێتە مایەی خێر بۆ هاوڵاتیان.

٢-فەرمان دەکات بە چاکەو خەڵکیشی لەسەر هان دەدات.

٣-هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی بەبێ کەمو کورتیو دڵەروکێ.

٤-بە فیڕۆنەدانی هەوڵو کۆششەکانی هاوڵاتیان.

٥-نەهێشتنی زوڵمو زۆردایو ڕاپەڕاندنی حەقو دادویستی.

٦-سوککردنی باری سەرشانی بەردەستەکانیو جێبەجێکردنی داواکانیان.

٧-بەردەوام ئامۆژگاری بە حەقو ئارامگرتن دەکات.

وە لە هەڵبژاردنی جێگری خراپ ئەم خاڵە خراپانەی لێدەکەوێتەوە:

١-جوانکردنی خراپە لەلای کاربەدەستەکەیو هەوڵ دەدا بۆ پیادەکردنی.

٢-تاوانبارکردنی بێ تاوانەکانو ناشرینکردنی پیاو چاکەکانو جوانکردنی پیاو خراپەکان.

٣-داپۆشینی حەقو دادپەروەرییو پێشێلکردنی بەرژەوەندییەکان.

٤-پێش خستنی سودی کەسێتی خۆی بەسەر خەڵکیدا.

٥-خۆ تێرکردنی لەسەر سکی جەماوەرو بە فیڕۆدانی دەستکەوتەکانیان.

بێگومان ئەمانەو چەندەها زەرەرو زیانی تر لە کۆمەڵگاو لە جەماوەر دەکەوێت، ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان چاکترین بەڵگەیە بۆ ڕاستێتی ئەم مەسەلەیە، بۆیە پێویستە لەسەرمان کە خواناسە پاکەکانو دەمو دەست پاکو ڕەفتار جوانەکان بکەین بە برا گەورەو سەرگەورەی خۆمانو کاروبارمانی پی بسپێرین، بۆ ئەوەی کارەکانمان بەرهەمدارو بەرەکەتدار بنو ئەو کەسانەشی بۆ خوا ساغ نەبوونەتەوە نەکرێن بە مشەخۆر بە سەر خەڵکیو بەسەر کاروباری موسوڵمانانەوە، هەتا لەو ڕێگەیەوە خیانەت بە گەلو میللەتو وڵات نەکرێتو داهاتو بەرهەمی خەڵکیش بە تاڵان بەلاش نەبرێتو نەخورێت.

## هەڵبژاردنی چاکترین کەس بۆ بەڕێوەبردن:-

بە یەك دەنگی هەموو زانایان بەبێ جیاوازییان لە بەدەسگرتنی ئاستی بەرپرسیارێتیپێدەبێت کەسانی شایستەو لێهاتوو دیاریبکرێتو دابنرێت بۆ ئەوەی کە بەسودترین بەرهەمو قازانجی هەبێت بۆ کەسانی ژێردەستەکانیان، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت ئەوا خەڵکی دەکەوێتە ژێر باری نەهامەتیو ناڕەحەتی، وە ڕێگاش بۆ زانینی چاکترین لێپرسراو ئەم سێ فەرمانەیە:

ا-زانینی ئەوەی کە مەبەستو گرنگە لە سەر ئەو کەسەی کە لێپرسراویەتی پێ دەسپێرێت.

ب-زانینی ئەو ڕێگایەی کە دەمانگەنێتە جێی مەبەست.

ج-زانینی کەسی لێهاتوو شایستەو باش بۆ کاری لێپرسراویەتی.

بۆ نموونە ئەوەی جێی مەبەستمانە ئەوەیە کە ئەو کەسەی بەرپرسیارێتی دادوەری (قضاء) ئەکەوێتە ژێر دەستەوە پێویستە جیاوازی نەخاتە نێوان خەڵکییەوەو هەروەها نەهێشتنی ناخۆشیو ناکۆکی لە نێوان خەڵکیدا.

دەبێت ئەم کارانەش بە فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکات، وە ئەو دوژمنایەتییەی کە دەکەوێتە نێو خەڵکییەوە بەهۆی خوێنڕشتنی یەکتری، وە یان بەهۆی ماڵو سامانەوە، وە یان بە هەر هۆیەکی ترەوە بێت، پێویستە لە سەر دادوەر کە ئەم فەرمانانە هەمووی لە ژێر ڕۆشنایی قورئانو فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ بە ئەنجام بگەیەنێت، هەموو مافەکان بگێڕێتەوە بۆ لای خاوەن مافەکان، وە دەستی ستەمکارو زۆردارەکان ببڕێتو نینۆکی دەستدرێژان بقرتێنێ. مەبەست لە دادوەری ئەمەیە، کە دەبێت مافو ئەرکی خەڵك پارێزراو بێت.

وە ئەو ڕێگایەی کە دەبێتە هۆی بەرپابوونو بە ئەنجام گەیاندنی دادوەری ئەوەیە کە دەبێت دادوەر (قازی) ئاشناو زانا بێت بە پێگەی ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا دەژیەنو دەبێت زانستی سەردەمیانەی هەبێت لەو کۆمەڵگایەی کە ژیانی تێدا دەباتە سەر، وە بەر چاوڕوونو شارەزا بێت بە زانستە ئیسلامییەکانو ئەحکامەکانی شەرعی هەتاکو لە نێوان خەڵکدا لەژێر ڕووناکی خۆری قورئانو سوننەتدا فەرمانڕەوایی بکات، بۆ ئەوەی ئارەزوو نەفسو شەیتانی تێکەڵاو نەبێت، وە یان دونیاپەرستیو نادادگەری تێکەڵاو نەکات، و دەبێت دادوەر بە زانستو دادپەروەریو ترسان لە خودا وەسف بکرێت، هەر بۆیە دەبینین خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ئاماژە بەم ڕاستییە دەکاتو دەفەرموێت:

(يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ) (ص:٢٦)،

واتە/ ئەی (داود) ئێمە تۆمان کردە جێنشین لەسەر زەویدا، کەواتە تۆش لە نێوانی خەڵکیدا حوکم بە حەقو ڕاستی بکەو شوێنی هەواو ئارەزووەکانت مەکەوە، چونکە ئەگەر شوێنی هواو ئارەزوو بکەویت ئەوا لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوا لات دەدات، وە ئەو کەسانەش کە لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوا لا دەدەن ئەوە سزای بە ئازاریان بۆ هەیە، و لە ڕۆژی دواییدا لەبیر ئەکرێن، چونکە ئەوان ڕۆژی دواییان لەبیر کردووە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (القضاء ثلاثة إثنان في النار وواحد في الجنة رجل علم الحق فقضى به فهو في الجنة ورجل قضى للناس على جهل فهو في النار ورجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار)[٤٦]

---

[٤٦] صحيح انظر صحيح الجامع للألباني رقم ٤٤٤٦

واته/ دادوەرەکان(قازی)یەکان سێ جۆرن:
دوانیان بۆ ئاگری دۆزەخەو یەکێکیان بۆ بەهەشت دەچێت، یەکەمیان پیاوێکە حەق و راستی ناسیوەو دەیزانێ و حوکمی (قەزاوەت)ی پێ دەکات. ئەوە بۆ بەهەشتە، وە یەکێکی تریان ئەوەیە حوکم لەسەر نەفامی و نەزانی دەکات، ئەمەیان بۆ ئاگری دۆزەخە، وە یەکێکی تریان ئەوەیە کە حەق ئەناسێ کەچی لە حوکمەکەیدا کاری پێ ناکات و لە رێگەی راست دەردەچێت، بێگومان ئەمەشیان هەر بۆ ئاگری دۆزەخە.
(ابن تیمیه) "خوای لێ رازی بێت" دەڵێت: (ویقدم فی ولایة القضاء الأعلم الأورع الأكفأ) واتە: ئەوەی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ دادوەریکردن زاناترین و لە خواترسترین و لێهاتووترین کەس دابنرێت، هەر لەمەشەوە پێوانە ئەکرێت و دەبێت لە هەموو بوارەکانی تردا هەر بەهەمان شێوەبێت، واتە: دەبێت بەرەوشتترین کەس و خواناسترین و بە تەقواترین و دڵسۆزترین کەس بێت و وە.. هتد..، بێگومان ئەمەش لە ئیسلامدا هیچ گرانییەکی تێدا نییە کە کەسانی بەو شێوەیە هەڵ بژێرن بۆ دادوەریکردن، چونکە زۆر زانای بەرێزی بەو شێوەیە هەیە کە شایستەی ئەو جێگە و پلە بێت، بە تایبەتی کە ئەو زانایەخاوەنی زانست و خواناسییە.
هەروەها (ابن تیمیه) رەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: پێویستە لەسەر کاربەدەستان (ولی الامر)ی موسڵمانان کە هەوڵ بدەن کە چاکترین و خواناسترین و زاناترین دادوەر(قازی) هەڵبژێرن بۆ ئەو جێگایە، تاکو دادوەری بەپێی بەرنامەی خوای پەروەردگار بچێت بەرێوە، و نەفس و ئارەزووی مرۆڤەکان و شەیتانەکانی تێکەڵاو نەبێت، هەتا هەرکەس مافی تەواوەتی خۆی پێ بدرێت و مافی کەس پێشێل نەکرێت..

## ئاگاداربوون لە لێهاتوویی خەیاڵی (وەهمی):

زۆر جاری وا بووە کە کۆمەڵە کەسانێك بۆ ئەوەی کە دەستیان لە پلەو پایەیەك گیر ببێت خۆیان لە جۆرە بەرگێکدا نیشانداوە بە رووکەش، وە لە ناخیشەوە بە شێوەیەکی تر واتە لە ناخەوە شێوەیەکن و لە رواڵەتیشدا شێوەیەکی تر هەر لە بەر ئەوەی کە پلەو پایەکەیان لە دەست نەچێت، وە یان بیانەوێت چنگی تێ گیربکەن و خەڵکانی رەش و رووتی تیابچەوسێنێتەوە.. تەنانەت زۆر جاری وا بووەکە ئەو کالاَ پۆشییەی کە کردوویانەتە بەریان بەناوی ئاین و خواناسی و چاکەکارییەوە بووە، یان بە ناوی تێکەیشتن و ئەمانەت و جوانی بەڕێوەبردن و، وە یان بە ناوی چەندەها شتی ترەوە دەستیان گرتووە بەسەر لێپرسراویەتی و پلەو پایەوەو خۆیان و خەڵکیانە پێ خەڵەتاندووە، لەبەر ئەوە ئیسلام ئاگاداریکردینەوەو هۆشیاری بە مرۆڤایەتی داوە کە وریابن و ئاگاداری ئەم جۆرە ڕواڵەتە ترسناکانە بن وە قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە ڕەفتارانەی لە ژێر پەردەی دووڕوویی (منافق) دەرخستووە بۆمان، و پەردەی لەسەر رووهەڵماڵییەوە، وەکو پەروەردگارمان دەفەرموێت:(وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ) (البقرة:١٤).

واتە/ کاتێك ئەو دووڕووانە کە دەگەن بە بڕواداران دەڵێن ئێمە ئیمانداریین وە کاتێك کە دەچنەوە بۆ لای ئاغا شەیتانییەکان دەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین، ئێمە هەر گاڵتە بە موسوڵمانان دەکەین.

وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت (وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ) (المنافقون:٤) واتە/ کاتێك بیان بینیت بە

شێوەو روویان سەرسامت دەکەن، ئەگەر قسە بکەن گوێ لە قسەکەیان ئەگریت، ئەڵێی داری هەڵپەسێراوون، وا گومان ئەبەن هەر قسەیەك (چرپەیەك) بکرێت قسەیە لەسەر ئەوان هەر ئەوانن دوژمن خۆتیان لێبپارێزە، خوا لە ناویان بەرێت، چۆن وا روو وەردەگێڕن؟!

هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لە کۆمەڵێك کەسان کردووە کە ئاین دەکەن بە ئامرازو بەربەستو پەردەپۆشێكو لە ژێریدا کاری دونیایی خۆیانیانی پێ جێبەجێ دەکەن.

بەم کارانەیان دەیانەوێت کە خەڵکی پێ بخەڵەتێننو لەسەر ئەو پلەو پایەی خۆیان بمێننەوە، وەکو (أبو هريرە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

(يخرج في اخر الزمان رجال يختلون الدنيا بالدين يلبسون للناس جلود الظأن من اللين ألسنتهم احلى من السكر وقلوبهم قلوب الذئاب يقول الله عز وجل: أبي يفترون أم عليّ يجترؤن؟ فبي حلفت لأبعثن على اولئك منهم فتنة تدع الحليم منهم حيران)[٤٧]

واتە: لە ئاخر زەماندا کۆمەڵە کەسانێك پەیدا دەبن بە ناوی دوونیاوە جلو بەرگی ئاین لەبەر دەکەن، دونیا بە ناوی دینەوە لەبەر چاوی خەڵکی جوان ئەکەن، وە پێستی مەڕ لەبەر دەکەن وە زمانیان لە شەکر شیرینترە، بەڵام لە ناوەوە دڵیان دڵی گورگە، بۆیە خوای گەورەش پێیان دەفەرموێت: (أبي يفترون؟! ام علي يجترئون؟) سوێند بێت بەوەی تۆی ناردووە دەبێت بەڵایەك بنێرمە سەر ئەو جۆرە کەسانە کە مرۆڤی لەسەر خۆ و ئاقڵو ژیر تیایدا سەرسامو حەیران بێت!!

---

[٤٧] ضعيف في ضعيف الجامع للألباني رقم ٦٤١٩

وە هەروەها لە سیفەتو ناکارە دزێوارەکانی ئەم جۆرە کەسانە ئەوەیە کە بەردەوام حەقو راستی هەڵدەگێڕنەوەو بە پێچەوانەشەوە، و لە هەمان کاتیشدا باوەڕیان بەو هەقە نییە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ) (البقرة:١٤) واتە/ کاتێك کە دەگەن بە بڕوا داران دەڵێن ئێمە ئیمانمان هێناوە، وە کاتێك کە دەچنەوە بۆ لای ئاغاکانیان دەڵێن لەگەڵ ئێوەداین، بەڵکو ئێمە گاڵتە بە موسوڵمانان دەکەین.

وە هەروها لەو پەندو ئامۆژگارییانەی کە لە پێغەمبەری خواوە بۆمان بەجێ ماوە بە توندی ئاگاداریکردوینەوە ئەوەیە کە خۆمان لەو دووڕوانە (منافقین) بپارێزین و بە ڕواڵەتیان نەخەڵەتێین و نەیانکەین بەکاربەدەستو فەرمانڕەوای خۆمانو، بەردەوام لە فێڵو تەڵەکە بازییەکانیان ئاگاداری کردوینیەتەوە، وە هەروەها لەو فرتوفێڵو تەڵەکە بازییانەی کە لە بەرامبەر بە موسوڵمانان دەیکەن، سەرباری ئەوانەی کە باسمانکرد جۆرەها کینەو بوغزاندنو تۆقاندن بەکاردەهێنن دژی باوەڕداران.

وە هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ هەمان رێبازو رەوشتیان گرتە بەر بۆ دوورکەوتنەوە لە فەرمانڕەوایی خەیاڵیی، بۆیە خواپەرستیو چەسپاوییان ئەکردە پێوەرو پێوانە بۆ بەرپرسیارێتییان لە فەرمانڕەوایەتییدا، وە بەهەمان شێوە لە جیهادو تێکۆشانیشدا، هەروەکو ئیمامی عومەر (خوا لێی رازی بێت) لە یەکێك لە ووتارەکانیدا ئاماژەی پێدەکاتو دەڵێت: (ئەی خەڵکینە، ئاگادار بن کە هەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ناومانا بوو بە هۆی سروشەوە (وحی) هەواڵو

باسی دووڕووەکانمام دەزانی، بەڵام کە ئێستا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کردووە سروش (وحی) نەماوەو کۆتایی پێ هاتووە، دەبێت ئێستا بە شێوازی قسەکردنیان و بە هۆی ئەوەی کە گومانی چاکەمان پێ بردونو خێرمان لە ناوچەوانیاندا بینی ئەوە کاریان پێ دەکەین، وە ئەگەر گومانی خراپمان پێ بردن بە چاکمان نەزانی ئەوە گوێییان نادەینێو، وە نهێنییەکانی خۆمان با لە نێوانی خواو خۆماندا بمێنێتەوە. بەڕاستی (ئیمامی عومەر)یش یەکێکە لەو کەسانەی کە دەتوانین شوێن پێی هەڵبگرین بیکەینە پێشەوای خۆمان چونکە خاوەنی بەرچاوڕوونییەکی بێ وێنە بووەو، زۆر لە وتەو گوفتارەکانی کە کردوونی لە گەڵ ئایەتەکانی (قورئانی پیرۆز) گونجاوو هاوتەریب بوون!

هەر ئیمامی عومەرە (خوا لێی ڕازی بێت) کە دەفەرموێت (لست بخب ولا خب یخدعنی) واتە/ نە فێڵبازمو نە فێڵبازیش دەتوانێ فریوم بدات.

## لە پاكژكردنەوەدا پێویستە دەست بە بنەمای خۆگریو پەیوەندداریدا بگرین

لە ئیسلامدا گردتنە دەستی بەرپرسیارێتی ئەوەندە كارێكو رێگایەكی ئاسان نییە وەكو ولاخێك وابێت هەر كەس ویستی سواری بێت، وە یان هەر كەس خوازیار بوو یەكسەر بیگاتێ. بە پێچەوانەوە لێپرسراوێتی لە ئیسلامدا خەڵكی لە دەستی را دەكات، وەكو كۆتو زنجیر وایەو نایانەوێت بیخەنە ملییەوە بەزۆر نەبێت، وەكو ملوانكەیەك وایە دەبێت بە زۆر بیكەن بە گەردنییەوە، ئەو دووروووانەی كە موسوڵمانان دەخەڵەتێنن بەوەی كە ئەو پۆستە وەر دەگرن، بەڵكو بەم كارەیان ستەم لە خودی خۆیانو خەڵكی دەكەن ئەوانە ناتوانن ئەو بارە قورسە هەڵبگرنو ئەو ئەمانەتە وەكو خۆی بە جێبهێنن، بەڵكو ئەوانەی كە ئەو بەرپرسیارێتییە بە جێدەهێنن ئەو كەسانەن كە توانستیان هەیە بۆ ئەو كارەو خاوەنی زانستو خۆپارێزنو ژیانیو رابوردوویان پاكو چاكە، پاشان بەردەوامێتی یان هەیەو جوانی بەرێوەبردنیشیان تیادا بەرجەستەیە. لە بەر ئەوە قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەیكردووە كە بەرگری بكرێت لە كارێك كە كەسێك پێی هەڵسێت هیچ زانستییەكی دەربارەی نەبێت چاك یان خراپ بەڵكو بچێت بە نەزانی بیكات. وەكو خوای كاربەجێ دەفەرموێت (وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً) (الاسراء:٣٦) واتە/ لە شتێك مەدوێ كە زانستت دەربارەی نییە چونكە بەراستی بیستنتو بینینتو تێگەیشتنت بەرپرسیاریت لەبەرامبەریدا. ئەمەش مەرجی شەرعییە كە دەبێت موسوڵمان رەچاوی بكات لە

پالفتەکردنی دانانی بەرپرسەکاندا کە دەبێت بپاڵێورێن بە شایەتی ئەو کەسانەی کە شایەتیان لێوەردەگیرێتو خاوەنی متمانەن لە ناو کۆمەڵگاکەیاندا، پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت (كفى بالمرء كذبا ان يحدث بكل ما سمع)[48] واتە/ بەسە بۆ درۆزنی کەسێك کە هەرچییەکی بیست بڕوای پێ بکاتو بچێت بیگێڕێتەوە، بەو واتایەی ئەمڕۆ ببێ بە ئامێری بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزانی ئیسلام بەرامبەر بە موسوڵمانانو ئیمانداران لەبەر ئەوە شایەتییەکان بە (ووتیو ئەڵێن) وەرناگیرێو متمانەی پێ ناکرێت.

ئیسلام بەرگریو قەدەغە دەکات لە پڕو پاگەندەی درۆو وە لە سەر بڵاوکردنەوەی پەخشنامەی درۆو دور لە واقیعو راستێتی، بەڵکو باوەڕ دەکات بە بەڵگەی راستو دروستی ئەو هەواڵو باسەی کە دەگات، دەربارەی ئەو کەسە، یان دەربارەی هەر مەبەستو ئامانجێك بێت، هەر بۆیە دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕزای بێت) جارێکیان گوێی لە پیاوێك دەبێت باسی کابرایەك دەکات بە چاکە، (ئیمامی عومەر)یش بانگی دەکاتو پێی دەڵێت/ ئایا سەفەرت لەگەڵدا کردووە، پیاوەکە دەڵێ: نەخێر ئیمامی عومەر پێی دەڵێت: تێکەڵاویت لەگەڵیدا هەیە؟ دەڵێت: نەخێر، ئیمامی عومەر پێی دەفەرموێت. سوێندبێت بەو خوایەی کە هیچ خودایەکی تر نییە تۆ ئە کەسە ناناسیت.

لەبەر ئەوە زانایانی ئیسلام زۆر بە گرنگی پێ لەسەر ئەو مەسەلەیە دادەگرن هەر لەبەر ئەوەیە کە (إبن الصلاح) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: هەموو جەماوەری ئیمامەکانو ئەهلی فەرموودەو فیقه دەیکەن بە مەرج لەسەر ئەو کەسانە کە دەبێت دادپەروەرو موسوڵمانی باڵغو

---

[48] اخرجه مسلم في صحيحه عن ابى هريرة

عاقڵو دوور لە هەموو خراپەیەك بنو پاشان زانا بن بە واتای زانای راستەقینەو خاوەنی قسەو بەڵێنی خۆیان بن، ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا بوو ئەوە دەکرێت بکرێتە لێپرسراو، وە بێگومان موسوڵمانان دەپارێزێت لە بەفیڕۆدانی مافەکانیان.

لەبەر ئەوە هیچ کاتێك پشت نا بەسرێت بەو باسو خواسانەی کە دەربارەی کەسێك دەکرێت، بەڵکو لێکۆڵینەوەیەکی ووردو زانستیانە لە سەر ووتەکانیو رەفتارەکانیو خواپەرستیو زانایيو لێهاتوویيو رابوردووی دەکرێت بۆ ئەوەی ئەو کەسە شایستەی ئەو شوێنە بێت کە پێی دەدرێت. و یەکێك لە زاناکانی تر کە ناوی (ابن الازرق)ە دەڵێت: پێویستە دوورکەوینەوە لە هەڵخەڵەتاندن بە رووکەش وە سوپاسو ستایشێك کە لە جێکەی خۆیدا نییە، وە نابێت بۆ کاری لێپرسراویەتی گوێ بدرێت بە ناوبانگو ناودەرکردنی کەسێك چونکە زۆر جار ئەو ناوبانگەی بەهۆی کاسە لێسەکانو ئەشۆمبیلا کردنی نارەوای خەڵکانی دیوەخانەکان دروست دەبێت بۆ کەسانی بالاتر لە خۆیان بۆ وەدەستخستنی بەرژەوەندییەکی دنیایی.

## هەڵبژاردنی لێهاتووەکان و ئەنجامە پەسەندو نایابەکانی:-

بەڵێ هەر کاتێك ئێمە توانیمان کەسانێکی شایستە بۆ ئەو جێگایانە هەڵبژێرین کە شایستەی جێگای خۆیان بن، ئەوە بێگومان بەروبووم و بەرهەمی چاکی دەبێت. چونکە ئەو کاتە مافی هیچ کەسێك ناخورێت و پێشێل ناکرێت و هەموو کەس لە ماڵ و سامانی ئەمین دەبێت، دڵەکان ئارام دەبن و فێڵ و تەڵەکە بازی بنەبڕ دەبێت لە راپەڕاندنی کارەکاندا، وە بەچاکی داواکارییەکانی پەروەردگار جێبەجێدەکرێت و، لە بەروو بوومی ئەم کەسە چاك و شیاوانەیە کە ئەم خاڵانە دێنە ئەنجام و بەرهەم:-

١-لە پێناوی بەرژەوەندی و سودگەیاندنی خەڵکی هەموو توانایەکی دەخاتە گەڕ.

٢-بەختیاری و کامەرانی باڵ دەکێشێ بەسەر وڵاتدا.

٣-ئەو کەسە دڵخۆش دەبێت بە پاراستنی نەبڕاوەی خوایی کە لەسەر بەجێهێنانی مافەکانی خواو خەڵکی ئەنجامی دگەیەنێت.

٤-حەق و راستی پیادە دەکرێت و دادپەروەری حوکم دەکات.

٥-کۆمەڵگە ئارامی و هێمنی بۆ دەگەڕێتەوە.

٦-کۆمەڵگە بە دوور دەبێت لە ستەم و زوڵم و دەستدرێژی کردنی ناحەزان.

٧-بڕینی دەستی زۆرداران و لە ڕەگ و ریشە دەرهێنانیان.

٨-سەرخستنی ئەو کەسانەی کە مافەکانیان خوراوە و ستەمیان لێکراوە.

٩-یاسا بەرقەرارو بەردەوام دەبێت، وە رێگەی راست و دروستی خۆی دەگرێتە بەر.

١٠-ترس و دڵە راوکێ لە دڵی خەڵکیدا دەڕەوێتەوە.

١١-بنەبڕکردنی خراپەو پشێوی و فەرمانکردن بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپە.

١٢-پەیڕەویکردن لە قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ.

١٣-ئاگری تازە داهێنەرە خراپەکان (بیدعەچییەکان) دەکوژێتەوە.

١٤-دەبێتە مایەی ڕەواندنەوەی توڕەیی خواو بارینی ڕەحمەتی پەروەردگار بەسەر گشت لایەکدا.

١٥-کۆمەڵگا دەبات بەرەو سەرفرازی و بە دووری دەخات لە ونبوون و لە ناوچوون.

بێگومان ئەمانەو چەندەها سیفەتی چاکتر لە ئەنجامی هەڵبژاردنی کەسانی شایستە بۆ جێگاکانیان بەرپا دەبێت و خۆشی و شادی و بەرەکەت و پیرۆزی لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاو دەبێتەوەو باڵی دادو یەکسانی خوای گەورە باڵ دەکێشێت بەسەر وڵاتدا، و بەهۆی ئەمەوە لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی لەگەڵ بەرپرسەکان خاوەنی پاداشت و پلەیەکی بەرز دەبن، چونکە تەنها بەرپرسی ئیماندار دەتوانێت خۆی برسی بکات لە پێناوی ئەوەی خەڵکی تێر بێت، شەونخونی بکێشێ لەبەر ئەوەی خەڵکی بە ئارامی بخەون، و دڵنیاو ئەمین بن لە پاراستنی ماڵ و سامانیان، لەم کاتەشدا مرۆڤی ئیمانداری لێپرسراو چاوەڕوانی هیچ پاداشتێك لە خەڵکی ناکات و ئامادەی بەرتیل و دەم چەورکردنیش نییە لە کەس.

## هەڵبژاردنی ناپاکان.. تاوان و ناپاکییە:-

لە کاتی هەڵبژاردنی کەسانێکدا کە نەجێی متمانەو نە لێهاتووشن، کە پۆستە گرنگەکانیان پێ بدرێتو، لە پلەکانی بەرپرسیارێتیدا دامەزرێنرێن، تاکو لەوێوە سەرپەرشتی بەرژەوەندییەکانو کاروباری خەڵکی بکەن، ئەوە بێگومان کۆمەڵێك ئاسەواری لێ دەبێتەوە، وەك:-

١-کەوتنە نێو کاری ناهەمواریو گزیکارییەوە کە ئیسلام قەدەغەی کردووەو کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە باریەوە فەرموویەتی (من غشنا فلیس منا)[٤٩] واتە- (هەر موسوڵمانێك گزیمان لێبکات، لە ئێمە نییە). گەورەترین گزیش کە هیچ گزییەکی تر لەو گەورەتر نەبێت بریتییە لە گزیکردن لە نەتەوە (گەل)، ئەمەش بە هۆی دانانی کەسانی نەشیاو بە سەرکاریان، تاکو کاروباریان بۆ بەڕێوەبرێت.

٢-کەوتنە نێو تاوانو ستەمکارییەوە، چونکە دانانو دامەزراندنی ناپاکان لەو جێگەو شوێنەی، کە شایستەی نین ستەمەو، بەمە تاوانێکی گەورە لەگەڵو نەتەوە دەکرێت، و کەسانی دەست پاكو شیاو لەو کارانە بێ بەش دەکرێنو لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دانانرێن، بەم رەنگە ستەمێك لەوانیش دەکرێت.

٣-کەوتنە نێو، ئەو سزا سەختەی کە خودا هەڕەشەی لەسەر کردووەو ئەوەش ئەوەیە کە هەر کەسێك گزی لە نەتەوەکەی بکات تێی دەکەوێتو لەناو دەچێت، کە بەو گزیکردنەش کەسانی چاك

---

[٤٩] تەواوکردنی ئەم فەرمودەە: (من عمل علینا السمع فلیس منا وغشنا فلیس منا) موسلمو ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە وەرگیراوەو لە صەحیحی جامعدا ژمارەی ٦٢١٨

هەڵنابژێرێت تاکو کاروباری خەڵکی بەڕێوە ببات، وەك پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی (ما من عبد يسترعيه الله يموت يوم يموت و هو غاش لرعيته الا حرم الله عليه الجنة)[٥٠].

واتە/ هەر بەندەیەك کە خودا دەیکاتە سەرپەرشتیاری خەڵکی و تا ڕۆژی دوایی گەر گزی لە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆی کردبێت و لە سەر ئەو حاڵەتە مردبێت، ئەوا خوداش بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

٤-دروستکردنی ڕق و کینە لە دەروونی خەڵکیدا چونکە بە دانای ناپاکان وەك سەرکاریان ڕق و کینەیان بۆ دروست دەبێت و وایان لێ دەکات بەربەرەکانیان بکەن و حەزی خۆ لێقوتارکردنیان لە دڵدا دروست دەبێت و حاڵەتێکی پشێوی و ملاملانێ و نا ئارامیش دەهێنێتە ئاراوە.

٥-هاتنە ئارای دۆخێکی پەرتەوازەیی و لێك دابڕان و ئاژاوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە کارو بارو مەسەلەکان لە شوێنی شیاوی خۆیاندا دانانرێن، ئیدی ڕاستییەکانیش ئاوەژوو دەکرێنەوەو، خراپە دەبێت بە چاکەو، چاکەش بە خراپە دادەنرێت و، کەسانی متمانەپێکراو بە خیانەت لە قەڵەم دەدرێن و، ئاسودەیی بۆ ستەمکارو ڕێگرەکان دابین دەبێت و، کەسانی بەدکارو سەرشۆڕ بەهێز دەکرێن و، کەسانی بەهێزو سەربەرزیش سەر شۆڕو بێ دەسەڵات دەکرێن.

بەڕاستی ئەمە حاڵەتێکە بە هۆی ناپاکی کردن و شوێن کەوتنی هەواو هەوەس و کەوتنە نێو ئەو ستەمەی کە ئیسلام قەدەغەی کردووە دروست دەبێت، کە لە قورئانیشدا هاتووەو، خودا فەرمویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ) (الأنفال:٢٧). واتە: ئەی

---

[٥٠] متفق عليه عن معقل بن يسار في صحيح الجامع رقم ٥٧٤٠.

ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خیانەت لە خواو پێغەمبەرەکەی مەکەن وە خیانەت لەو ئەمانەتانە مەکەن کە لە ژێر دەستاندایە وە خۆتان ئاگادارن بەو شتەی کە پێتان سپێردراوە.

وە لە ئایەتێکی تر دەفەرموێت: (وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَنْ ذِكْرِهِمْ مُعْرِضُونَ) (المؤمنون: ٧١) واتە/ (ئەگەر حەق و حەقیقەت شوێنی ئارەزووی ئەوانە بکەوتایە ئاسمانەکان و زەوی هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێواو تیا دەچوو سەرگەردان دەبوو، لە حاڵێکدا ئێمە قورئانێکمان بۆ رەوانە کرادوون (کە یادخەرەوەی هەموو چاکەیەکە) کەچی ئەوانە لە بەرانبەر ئەو یاد خەرەوانەدا سەرکەش و یاخین و پشتی تێدەکەن). (وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ)(النحل: من الآية٣٣) واتە/ خوا ستەمی لێ نەکردوون، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە.

*  *  *

قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم):

**(المسلم من سلم المسلمون من يده ولسانه)**

**وقال**

**(إنما بعثت لأتمم مكارم الاخلاق)**

## ئاسەوارە خراپەکانی دانانی کەسانی ناپاک:-

١-ئەو کەسە نەشیاوو متمانە پێنەکراوانە دەبنە سەرچاوەی بەڵاو کارەسات بۆ نەتەوە، هەروەها باروودۆخی خەڵکی و پێداویستی و داواکارییەکانیان ژێر پێ و پەردەپۆش دەکەن و هەرگیز رووکاری راستەقینەی حاڵەتە جۆر بەجۆرەکانی خەڵکی و سکاڵاو مەینەتییەکانیشیان ناخەنە روو.

وە خەڵکیش لە ژێر سایەی ئەم جۆرە ناپاکانەدا بە دەست ستەم و زۆرداریی ئەمان و خۆبەخۆی یەکتر دەناڵێنن و کەسێکیش نا بینن کە دادەوەرییان بکات و، لە نێوانی سەرپەرشتیارو سەرپەرشتکراواندا مافیان دەخورێت، لەوانەشە خەڵکی پەیڕەوی سیاسەتی چەواشەکردن و پەیمانی درۆ بکەن و، بەم شێوەیەش کاتیان بە فیڕۆ دەدەن و، چەندینساڵیش لە تەمەنیان بە بێ سود دەڕوات.

٢-نەمانی ئامۆژگاری و، بزربوونی کارکردن بە چاکەو رێگرتن لە خراپە، چونکە ئەو جۆرە سەرپەرشتیارە نەشیاوانە هیچ بایەخێك بەم لایەنە نادەن، بەڵکو لەوانەیە بە پێچەوانەشەوە رەفتار بکەن و، خراپە جوان بکەن و چاکەش ناشرین بکەن. لەمەوە ئیسلام هاتووەو جەختی کردۆتە سەر گرنگی بەجێگەیاندنی فەرمانڕوایەتی وەك خۆی، پاراستنی ئەمانەتی خەڵکی و گێڕاندنەوەیان بۆ کەسانی شیاویان. وەك خوداش دەفەرموێت (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ)(النساء: من الآية٥٨).

واتە/ خودا فەرمانتان پێ دەكات كە سپاردەكان بە خاوەنی خۆیان بگەیەنن و ئەگەر حوكمیشتان لە نێو خەڵكیدات كرد بە دادپەروەری بە ئەنجامی بگەیەنن.

٣-هەر لە ئاسەوارە ناشرینەكانی دانانی كەسانی ناپاك، گەیاندنی خەڵكییە بە شكست و نوشست و نا ئومێدی و نەبوونی و هەژاری و سەرشۆڕی و لاوازی، كە بەم دەردە كوشندەش نەتەوەی ئیسلام لە كاروانی شارستانییەت و پێشكەوتنی گەلان دوا دەكەوێت، ئیدی پەرتەوازەیی و رەوتی چینایەتی و لاوازیی لە نێو ریزەكانی گەلدا بڵاو دەبێتەوە.

*    *    *

عومەری كوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت:

ئەگەر یەكێك لە ئاسمانەوە بانگ بكات:
خەڵكینە ئێوە هەمووتان دەچنە بەهەشتەوە
تەنها یەكێكتان نەبێت، دەترسم ئەو یەكە من
بم.
وە ئەگەر یەكێك بانگ بكات:
خەڵكینە ئێوە هەمووتان دەچنە دۆزەخەوە
تەنها یەكێكتان نەبێت، وا دەزانم ئەو كەسە
منم!

## فەرمانڕەوایی بەو کەسە نادرێت کە داوای دەکات‌و هەوڵی بۆ دەدات:-

پلەی بەرز لە چەمکی بەڕێوەبردنی ئیسلامیدا سپاردەیەکی سەرشانە، نەك گەرەیی‌و شکۆمەندی، و هیچ کەسێکیش توانای لە ئەستۆنانی ئەو سپاردەیەی نییە تەنها ئەو کەسە نبێت کە بە زانستێکی بەکەڵك‌و ئاکارێکی تۆکمەو حەوسەڵەیەکی گەورەو، قوربانی دانێکی راستگۆیانەوە خۆی بۆ ئامادە کردبێت.. جا لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی بە جۆرێکی دی بۆ پلەو پایە بەرزەکان دەروانن، کە گوایە بەختەوەرییەکی گەورەیە لە دەسەڵات‌و سەروەری‌و ماڵ‌و ساماندا، بە هۆیەوە لە نیازە راستەقینەییەکەی بەرپرسیارێتی دەردەچن کە لە کورتترین مانایدا (بەرپرسیارێتی راستەقینە) واتە شەونخونی بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی، بەجێگەیاندنی مافەکانیان‌و دڵخۆشکردنیان لە بژێوی‌و گوزەرانیاندا، هاندان‌و پابەندکردنیان لە سەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا.

ئا بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی راستەقینە دێتە دی، بۆیە لە حیکمەتەکانی ئیسلامیشدا هاتووە کە رێ نادات بە مرۆڤی موسوڵمان داوای سەرۆکایەتی‌و بەرپرسیارێتی بکات بەشێوەیەکی نارەوا. لەم بارەوە لە (عبدالرحمنی کوڕی سمرە)وە (خوای لێ رازی بێت)- گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (یا عبدالرحمن لا تسأل الآمارة فإنك إن أعطيتها عن مسالة وكلت اليها وإن اعطيتها من غير مسألة اعنت عليها).

واتە/ ئەی -عبدالرحمن- داوای پلەو پایەی سەرۆکایەتی مەکە چونکە ئەگەر بە داوای خۆت پێت بسپێردرێت ئەوا خودا تەنها تەسلیمی خۆتت دەکات، بەلام ئەگەر بەبێ داوای خۆی ئەو پلەیەت پێ بسپێردرێت ئەوا لە لایەن خودا کۆمەك و پشتگیریت لێدەکرێت.

هەروەها لە ژیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە داکۆکی کردووە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك داوای پلەی فەرمانڕەوایی هەرێمێك بکات ئەوا بە پێی یاسای ئیسلام پێی نادرێت، وەك لەو فەرمودەیەدا کە (أبو موسی اشعری) خوا لێی رازی بێت گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی (من و دوو پیاوی هۆزەکەم چوینە لای پێغەمبەری خودا ﷺ یەکێکیان پێی گوت: (ئەی پێغەمبەری خوا بمکە بە ئەمیر، ئەوی تریشیان هەمان داوای لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی (ئێمە ئەم کارە ناسپێرین بەو کەسەی داوای دەکات یان سورە لە سەری). و کاتێك هاوەڵێکی بەڕێزی وەك (ابو ذر)یش ئەو داوایەی لێکردووە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە (يا أبا ذر إنك ضعيف وإنها أمانة وإنها يوم القيامة خذي وندامة إلا من أخذها بحقها وأدى الذى عليه فيها). واتە/ (ئەی ئەبو زەر تۆ لەم بوارەدا لاوازیت و، ئەو پلەی ئەمیرایەتیەش ئەمانەت و سپاردەیەو، لە رۆژی قیامەتیشدا سەرشۆڕی و پەشیمانی بەسەر خاوەنەکەیدا دێنێت، تەنها ئەو کەسە شایستەیەتی کە هەقی تەواوی خۆی پێی دەدات و ئەو مافانەی لەسەر خۆیشیەتی بەشێوەیەکی راست جێبەجێی دەکات).

لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتووە دەفەرموێت (لا تطلب الامارة فانك ان طلبتها باستشراف نفس وكلت إليها) واتە/ داوای ئەمیرایەتی مەکە، چونکە ئەگەر بە داوای سەرپەرشتی خۆت پێت بسپێردرێت ئەوا نەفسی خۆت تەنها دەدرێتە دەست خۆت و لە لایەن خوداوە کۆمەك ناکرێیت.

(ابن تيميه)ش- رەحمەتی خوای لێبێت- هۆو حیکمەتی رەتکردنەوەی داواکاری ئەو کەسە کە داوای (سەرۆکایەتی)و لێپرسراوێتی (أمارة) دەکات، روون کردۆتەوەو، گوتوویەتی:-

(چونکە ژیانی زۆربەی خەڵکی تێك دەچێتو کاتێك ماڵو سامان بکەوێتە دەست سەرۆکێکی هەل پەرست.)

-و کعب کوڕی مالك-یش لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی (ما ذئبان جائعان أرسلا في زريبة غنم بافسد لها من حرص المرء على المال والشرف لدينه). واتە/ دوو گورگی برسیو هار گەر بکەونە نێو ڕانە مەڕێکەوە، هێندەی سووربوونی ئەو کەسە هەل پەرستە خراپ تێکدەر نییە کە لە ئاکامی داواکردنی پلەو پایەو ماڵو سامان دینەکەی خۆی تێك دەدات.

کە وابوو بزانە: بێگومان سووربوونی مرۆڤ لەسەر داواکردنی ماڵو پلەو پایە وەك ئەو دوو گورگە برسییە یان لێ دێتو بەڵکو زیاتر لەو دوو گورگە برسییە کە پەرژینی ڕانە مەڕەکە دەشێوێننو پەلاماریان دەدەنو لێیان دەخۆنو کەلە پارچەیان دەکەنو لێیان وون دەکەن خراپترو تێکدەر ترن.

لەگەڵ ئەم ڕێگرتنو قەدەغەکردنی داوای لێپرسراویەتی (ئەمیرایەتی)یەشدا، زانایانو، گوتوویانە (بێگومان ڕێگرتن لە داواکاری ئەمیرایەتیو سووربوون لەسەریشیو، قەدەغەکردنی ئەو کارە لە خوازیارەکەی، لە بارودۆخە ئاساییەکانداو، واتە لەو حاڵەتانەدا (سەردەمی باڵادەستی حوکمی ئیسلامدا) کەوا کەسانی شایستە لەوانەی مەرجەکانی لێهاتوویان تێدا بێت، هەبنو دیارو ڕێزلێگیراو بن، بەڵام ئەگەر هیچ کەسێك نەبوو تەنها یەك کەسی کارامەو لێهاتوو

نەبێتو، ئەگەر بە دانانی کەسانی تر زیان بە موسوڵمانان بگەیەنرێت، ئەوا لەو جۆرە کاتانەدا، وەك فەرزێکی تەواو (فرض عين) لەسەر خۆی دەبێت کە پێویستە کارەکە لە ئەستۆ بگرێت، سا ئیتر بە داواکاری خۆیشی بێت، یاخود بە دامەزراندنی لە لایەن فەرمانڕەواوە، خۆ ئەگەر داواشی بکات، پێویستە فەرمانڕەوا بە دەم داواکاریەکەیەوە بچێت، چونکە لەو کاتەدا بەرژەوەندی خەڵکی ئاوا بەدی دێت.. لەسەر ئەم بۆچوونەش زانایان داواکارییکی (یوسف)یان، سلاوی خوای لێبێت- بۆ بەرپرسیارێتی گەنجینەکانی وڵات لە (عزیزی مصر) بە رەوا داناوە، ئەوەبوو داوای ئەو بەرپرسیارێتییەی کردو کەسی دی توانای ئەوە جێگەیەی نەبوو، بەم هۆیەوە بووە خاوەنی پلەی شایستەی خۆی لە وڵاتدا، وەك لە پێشدا بە عەزیزی گوتبوو:- بمکە بە سەر کاری گەنجینەکانی زەوی لە وڵاتداو منیش بێگومان پارێزەریان دەبمو زاناشم لە بارەیانەوە، وەك خوای گەورە لە زمانی (یوسف پێغەمبەر)ەوە دەفەرموێت: (قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ) (يوسف:٥٥).

واتە/ یوسف وتی: حەز دەکەم بمکەیت بە لێپرسراوی سامانی سەر زەوی ئەم وڵاتە چونکە من لە خۆم رادەبینم کە شت بپارێزمو زاناشم کە چۆن دەیپارێزم..

بە یارمەتی خودا تەواو بوو

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# ناوەڕۆك


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| ١- پێشەكی وەرگێڕ | ٤ |
| ٢-پێشەكی نووسەر | ٦ |
| ٣-كەسایەتییەكی كامڵی ئیسلامیی | ٧ |

بەشی یەكەم

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| ٤-سیفەتەكانی بەڕێوەبردنی سەركەوتوو( بەڕێوەبردن و بنەمای ئەمانەت) | ١٠ |
| ٥-بەڕێوەبردن و بنەمایی زانست و شارەزایی | ١٥ |
| ٦-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی خۆ بە كەم زانین (خاكەرایی) | ١٨ |
| ٧-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو -سنگ فراوانی | ٢٠ |
| ٨-بەڕێوەبردن و بنەمای پابەندبوون بە هێزەوە | ٢٤ |
| ٩-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی پشودرێژیی (حلم) | ٢٨ |
| ١٠-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی نەرم و نیانی | ٣٢ |
| ١١-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی لێبووردن | ٣٤ |
| ١٢-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سەرپەرشتی لە نزیكەوە | ٣٦ |
| ١٣-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو -بە توانا لە ئاراستەكردندا | ٣٩ |
| ١٤-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی راوێژكردن | ٤٣ |
| ١٥-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو دیاریكردنی پسپۆڕییەكان | ٤٧ |
| ١٦-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی دڵسۆزی | ٥٠ |
| ١٧-بەڕێوەبردنی سەركەوتوو سیفەتی راستگۆیی | ٥٤ |

١٨-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو دانانان بە هەڵەدا................٥٨
بەشی دووەم
١٩-چۆن بەڕێوەبردنی لێهاتووی بەرز دابینبکەین؟............٦٢
٢٠-وەرگرتنی بنەمای نەخشەکێشان و ڕێکخستن
(پەیڕەویکردنی بنەمای تەخشەکێشان و پلان دانان)..........٦٥
٢١-پەیڕەویکردنی بنەمای ڕێکخستن...........................٦٧
٢٢-چاکی و ڕێك و پێکی بەڕێوەبردن.............................٧٠
٢٣-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو ستایشکردنی هاوەڵەکانی.....٧٣
بەشی سێیەم
٢٤-چۆن لێپرسراوی شارەزاو بە توانا هەڵدەبژێرێت.........٧٨
٢٥-بەڕێوەبردنی سەرکەوتوو.. زیرەکی........................٨٣
٢٦-پێویستە یاریدەدەرە لێهاتووەکان هەڵبژێردرێن..........٨٦
٢٧-هەڵبژاردنی چاکترین کەس بۆ بەڕێوەبردن................٩٠
٢٨-ئاگاداربوون لە لێهاتوویی خەیاڵی (وەهمی)..............٩٣
٢٩-لە پاکژکردنەوەدا پێویستە دەست بە بنەمای خۆگری و
پەیوەندارییدا بگرین.................................................٩٧
٣٠-هەڵبژاردنی لێهاتووەکان و ئەنجامە پەسەندو
نایابەکانی............................................................١٠٠
٣١-هەڵبژاردنی ناپاکان تاوان و ناپاکییە....................١٠٢
٣٢-ئاسەوارە خراپەکانی دانانی کەسانی ناپاك.............١٠٥
٣٣-فەرمانڕەوایی بەو کەسە نادرێت کە داوای دەکات و
هەوڵی بۆ دەدات....................................................١٠٧

